له پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

96

سالّی نۆیەم

حوزەیرانی ٢٠١٦

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی



## لە ساڵیادی بڕیاردا



## تۆ!

## لەگەڵ فانی شاعیردا

دەروونی بەخشندە، هەرگیز پیر نابێت!

قەڵەمێکو داهاتووی دوو منداڵ!


رمضان كريم
القرآن الكريم
ڕەمەزان
گوڵاوبارانیێکی ئاسمانی
سروەیەکی فیردوەسی
میهرێکی بێسنووری خودایی
دەستێکی ئاوریشمین
نیگایەکی هێمن
دڵێکی سپی
ئامێزێکی پڕ لە خێر
دەبێتە میوانتان..
لە پێشوازیدا بن...
RASAN
Group

خاوەنی ئیمتیاز
د. مەسعوود تــاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر
د. عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین
بەرزان ئەبوبەکر

No: 96
حوزەیرانی
2016

دەستەی نووسەران
ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگــەرد فـــارس
زاهـــیر زانـــا
گوڵان حەمەئەمین
محەممەد مێرگەیی
محەممەد هاشم
وەهـاب حەسـیب
یەحیـــا محەممەد

بەشی هونەریو دیزاین
جمال دەروێش
پشتیوان عبدالرحمن
ئارام محمد نەبی
تایپ
کەلسوم جەلال

ڕاوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

ناونیشانی گۆڤار
سلێمانی: گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤
تەنیشت باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت
٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢
هەولێر: ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

bryarmagazine
bryarmagazin@gmail.com
bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد
دابەشکردن: پەیك/ 07708649210
نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

**مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی**

**ساڵی نۆیەم - ژمارە 96 - حوزەیرانی 2016**




# کارگێڕیو بازاڕسازی




# لە ساڵیادی بڕیاردا

سالٚ دیٚتو دەڕواتو بڕیار بەردەوامەو بەهیٚمنی ڕیٚگای خۆی دەبڕیٚت!

لەگەڵ هەموو ئەو کیٚشەو گرفتو نارەحەتییانەی دیٚنە ڕیٚ، بڕیار لە خزمەتکردن ماندوو نابیٚتو خەرمانی وشەو پەیڤی جوانی بەبرشتترەو گوڵزاری هیواو خۆزگەو ئاواتەکانی ڕازاوەترە!

چەند جوانە، بیٚ چاوەڕوانی سوپاسو بیٚ شاباش، بڕیار کاری خۆی دەکاتو ئەرکی خۆی جیٚبەجیٚ دەکاتو ساڵانەش ئیٚمە بەشەرمنی، پیٚشوازی لە ساڵیادی لەدایکبوونی دەکەینو ناتوانین ڕیٚوڕەسمیٚکی شایستە، بەو یادە گەورەیە ڕیٚك بخەین!

بڕیار بە ژمارە "٩٦" هەشت ساڵی تەمەنی تەواو دەکاتو مۆمی نۆیەمی تەمەنی دادەگیرسیٚنیٚت!

هەشت ساڵ، تەمەنی پڕ لە شکۆداریو بەرزیو جوانیو خۆشەویستی....

هەشت ساڵ، ئاویٚتەبوونی ڕۆحو ئاویٚزانبوونی دڵو دەستلەملانی ئەوین...

هەشت ساڵ، لە قوتابخانەی مرۆڤبوونو ڕاستیو پاکیو میهرو دۆزینەوەی خوددا، وانەی بەردەوامو زانستیو بیٚسنوور!

هەشت ساڵ، پەروەردەو گەشەپیٚدانو ڕیٚکخستنی ژیان!

هەشت ساڵ، گوڵبارانو گوڵاوپرژیٚنی ڕۆح!

هەشت ساڵ، چرا بۆ تاریکترین شەوەکان!

هەشت ساڵ، خەندە بۆ ئەستەمترین ساتەکان!

هەشت ساڵ، هیوا بۆ دژوارترین بارودۆخەکان!

هەشت ساڵ، وزەو توانا بۆ نارەحەتترینو سەختترین ڕۆژەکانی ژیان!

هەشت ساڵ، هاوڕیٚیەتی پڕ لە وەفاو خۆشەویستیو ئامۆژگاریی جوان، بیٚئەوەی چرکەیەك، دڵی ئازیزیٚکی یەشاندبیٚت!

هەشت ساڵ، لیٚوانلیٚو لە جوانی....

جوانییەك، کە مانا بە هەموو جوانییەك دەبەخشیٚت.

پیرۆزە هەڵکردنی نۆیەمین مۆمی تەمەنت، ئەی ئازیزترین ئازیز!

سلاٚو لە ئیٚوەش ستافی ماندونەناسی بڕیارو سەربازانی ون!!
کاروانی خۆشەویستیو ڕیٚبوارانی ڕیٚگای نوور!

# کارگێڕی بە گوفتار

کۆشكو تەلاری ستەمکاران، زیندانن!

میخائیل نەعیمە

هەرگیز باسی ئەو شتە مەکە، کە دەیبەخشیت،
بەڵام باسی ئەو شتە بکە، کە وەری دەگریت!

سرفانتس

هیچ دەوڵەمەندییەك بە ئەندازەی دەوڵەمەندی عەقڵ نییە،
هیچ هەژارییەکیش وەکوو هەژاری نەزانین نییە،
هیچ میراتییەکیش وەکوو میراتی ئەدەبو ڕەوشتبەرزی نییە!

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیب

ئەو کەسەی لە هاویندا دەماغی دەکوڵێت،
لە زستاندا مەنجەڵی دەکوڵێت.

نەزانراوە

دەوڵەمەندترین مرۆڤەکانی دونیا، جگە لە کفنێك،
هیچ شتێکی دیکە لەگەڵ خۆیدا نابات!

نەزانراوە

# دەروونی بەخشندە، هەرگیز پیر نابێت!

ئـەو گەنجەی کە لێپرسـراوی سـندووقێکی کۆکردنەوەی کۆمـەك بوو، لـە یەکێك لە بازاڕەکاندا، دەمـەو ئێوارە خەریکی کۆکردنـەوەی شـتومەکەکانی بوو، کاتێك خەریـك بوو، دەرگای بازاڕەکە دادەخراو کەش‌و هەواش تادەهات، سـاردتر دەبوو، بەفر دەوروبەری داپۆشیبوو!

لەناکاو پیرەمێردێکی بەسـاڵاچوو، کە بەئاستەم دەیتوانی، بـە ڕێگادا بڕوات، بە هێزی گۆچانەکەی هەنگاوی دەنا، گەنجەکە لـە ناخەوە بەتووڕەیی لەگەڵ خۆیدا قسـەی دەکـردو دەیگوت: ئەم پیرەمێردە، کاتێکی دی دەسـت نەکەوتووە، وا بەم درەنگانە هاتووە؟!

پیرەمێردەکە، لە سـندووقەکە نزیك بوویەوەو دەسـتێکی زبری وەك کۆتەرەداری هێنایە دەرێ‌و چوار سکەی کانزایی خستە نێو سندووقەکەوە.

لاوەکـە، بـە مامەپیرەی گوت: سوپاسـت دەکـەم بۆ ئەم بەخشینەت.

پیرەمێرد لە وەڵامدا گوتی: ناتوانم خۆم بگرم‌و بەشـداری نەکەم!

لاوەکە پێی سـەیربوو، پیرەمێردێك بەم زەحمەتە، بگاتە ئێـرەو بۆ بەخشـینی چوار سـکە، کـە بەهاکـەی تەنها چەند سەنتێکە؟!

بەڵام دواتر دەرکەوت، کە ئەو چوار سکەیە، ئاڵتوونی سافو بێگەرد بوون‌و سکەی ئاسایی نەبوون‌و نرخیان سەدان دۆلارە!

لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١. کاتێـك بەخشـندەیی ئـارەزووی بەخشـین، لـە ناخی مرۆڤەوە هەڵدەقوڵێ، هیچ هێزێك ناتوانێ، ڕێگای پێ بگرێت.

٢. مرۆڤـە چاکخـوازەکان، ناتوانـن بەرامبـەر ئـازاری هەژارەکان، بێدەنگ بن.

٣. بەخشـین چەنـدە یارمەتییە بۆ هـەژاران، ئەوەندەش مایەی خۆشحاڵی‌و ئاسوودەیی دڵی تۆیە!

٤. ناڕەحەتـی‌و سـەرماو زەحمەت، مرۆڤـە چاکخوازەکان سارد ناکاتەوە لە چاکەکردن، بەڵکوو زێتر هەست بە ناڕەحەتی‌و سەختی ژیانی هەژارەکان دەکەن!

٥. بەخشین، تەنها بەشی دەوڵەمەندو داراکان نییە، بەڵکوو هەموو مرۆڤێکی ڕاستەقینە، دەتوانێ ببەخشێت!

٦. با ببەخشـین؛ بە هیوای پاداشتی خودایی‌و ئاسوودەیی دەروونمان، بۆ هیچی دی نا.

٧. با خۆمان لەسـەر بەخشـین ڕابهێنین، گەر وا نەکەین؛ ناتوانین بۆ هەمیشە بەخشندە بین، بەڵام ئەگەر وامان کرد؛ ئەوا بۆ هەمیشـە، بەبەخشـندەیی دەمێنینەوە؛ چونکی بەخشندەیی، هەرگیز پیر نابێت!



# تەنها ٧ بۆ سەرکردەکان

جیاوازیی نێوان کەسی سەرکەوتوو، کەسانی دیکە،
بریتی نییە لە نەبوونی خاڵی بەهێزو نەبوونی زانستو شارەزایی،
بەڵکوو بریتییە لە لەدەستدانی ویستو ئیرادە!

فینس لومباردی

بڕیارو کاری ڕاست.. ڕاستە، با هەموانیش دژی بن،
بڕیارو کاری هەڵەش.. هەڵەیە، گەرچی هەموانیش لەگەڵیدا بن.

ویلیام بین

ئەو کەسانەی دەتوانن کۆنترۆڵی خۆیان بکەن،
دەتوانن کۆنترۆڵی کەسانی دیکەش بکەن.

ویلیام هازلیت

سەرکردەی ڕاستەقینە، هەرگیز خۆی لەسەرو شوێنکەوتوانییەوە
دانانێت، تەنها لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیدا نەبێت.

یولز ئورمونت

سەرکردە.. کەس ناتوانێت گومان لە پاکی تۆ بکات،
ئەگەر پاکی تۆ جێی گومان نەبێت.

ناسانیل برونر

## ڕەوشتو ئاکاری سەرکردە

بەشی چوارەم



# چۆن دەبێت بە سەرکردە؟!

**سەرکردە - لە سەرەتاوەو بەر لە هەموو شتێك - دادگەرە**

کاتێك شێوازی بەئەنجامگەیاندنی کار، یان بەشکردنی ڕاست دەکەیتەوە..، یان پلەبەرزکردنەوەیەك دەردەکەیت، یاخود بڕی مووچە زۆر دەکەیت، یاخۆ بڕێك کارمەند، دەهێڵیتەوە، یا دەردەکەیت؛ ئەوا شوێنەواری ئەم بڕیاردانەت، لە سەرجەم ئیشکەرو کارمەندەکاندا ڕەنگ دەداتەوە، لەبەر ئەمە، دادپەروەربوونت، بەشێکە لە گرنگیدانت بەو جێگەیە.

بۆ وێنە: گەر کارمەندێك، پلەبەرزکردنەوەی بەدەست هێنا، بێئەوەی شیاوی بێت؛ ئەوا بە لای کەمەوە، دە دانە کارمەندی قینلەدڵو ڕقهەستاوت دەبێت.

گەر کارمەندێکیش، لەسەر هەڵەیەك کە نەیکردبوو، سەرکۆنە کرا؛ ئەو دەمە ورەو وزەی گشت چواردەورەکەی دادەبەزێتو ئەم سەرزەنشتو سەرکۆنەیە، کار لە کاریان دەکات!

ئەو کاتەی کارمەندێك، تووشی هەڵەیەك دەبێت؛ دەبێت سەرنجی بە لای هەڵەکەیدا ڕابکێشرێتو دان بە هەڵەکەیدا بنێ، پاشان کارەکە تێ دەپەڕێنرێت.

بێگومان هەڵەکان، کۆمەڵە دەرفەتێکی باشو لەبارن بۆ فێربوون.. گورزە قامچی نین، بۆ شکاندنی شکۆو دارنینی سەربەرزیو ڕێز لە دەروونی خەڵکیدا.

**سەرکردە جێی باوەڕە**

جێمتمانەیی، سەرڕاستیو ئەمەکداری، یان ئەمانەتپارێزی دەگرێتەوە. لە ئاستە هەرەبڵندەکەیدا ئەوەیە: ڕێكوڕاست لەگەڵ سەرۆکەکانتدا، بەوەی خۆشییان لە بیستنی نایەت، بدوێیت. لە ئاستە نزمەکەیدا. واتای ئەوەیە: بێ پێچوپەنا لەگەڵ ژێردەستەکاندا، باسی چاکەو خراپەیان بکەیت، ئەمەش لەبەرئەوەی جێباوەڕی، یان سەرڕاستیو ئەمەکداری، ئەوە لە بەرپۆەبەرو سەرکار دەخوازێت، پێ لە هەڵەکانی بنێت!

خۆی ڕاستیگوتن - بێئەوەی کەسانی دی دڵگران بکەیت، یان بە دووڕوو دەربکەویت - ئاسان نییە.. بەڵام دەبێت جێمتمانەیی، ئەمانەتپارێزی، یان سەرڕاستیو ئەمەکداری، ببێت بە بەدیهێنەری بەرژەوەندیی هەموان -کۆمپانیاو ئیشکەرەکان تێیدا- ئەویش ئامانجی هەرەباڵایە.

**سەرکردە هیوابەرزە**

سەرکردە بە سرووشتی خۆی دڵ پڕ هیوایە، هیوابەرزە، بەڵام سەرکردەی نموونەیی، لە هیوابەرزیی خۆیدا ناوەستێتەوە، بەڵکو بۆ هەمووان تێ دەپەڕێتو گشت ئیشکەرەکان لەگەڵیدا دادەپۆشێت.. ئەوسا ئەو بە سەرکەوتنیان خۆشحاڵ دەبێتو بەشدارییان لەگەڵدا دەکات.

بەمەش کەسانی دی، بە تینوتاو هێزو وزەکەی خۆی هان دەدات، ئەمجا گشت لایەك بە پەیژەی سەرکەوتندا هەڵدەگەڕێن.

وەلێ دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگیرێت، کە هیوابەرزی وەك هەموو ئاکارە ئەرێنیو خوازراوەکان، دەکرێت ئاکامگەلی خراپی هەبێت.. هەر بۆیە ئەو هیوابەرزییەی ئەرکەکەی لەسەر شانی کەسانی دیکەیە، یان بە قوربانیدانی ڕەوشتو نەریتە. خۆی لە خۆیدا، ئەوە هیوابەرزییەکی ڕووخێنەرە، نەك هیوابەرزییەکی بنیاتنەر.

هیوابەرزی، سەر بۆ گۆڕانکاری دەکێشێت، زۆرێك لە خەڵکیش لە گۆڕانکاری دەترسێن، بەهەڵمەتیو تاودانیش، کە لە سنووری خۆی ڕەتبوو، ڕێسەکەی دەکاتەوە بە خوری، بۆیە سەرکردەی سەرکەوتوو، دەزانێت کەی جڵەوی لێ ڕادەکێشێتو چ وەختێکیش شلی دەکاتەوە.

سەرکردەی ڕاستەقینە، بەوپەڕی خێراییەوە دەست بەکار دەکات، کەچی بەجۆرێك دەردەکەوێت، هەردەڵێیت زۆر بەهێواشیو بەشێنەیی ڕێ دەکات. ئەو پێداچوونەوەو دەسکارییەکی هێواشو هەڵمەتو هەڵچوونێکی ئەسپایی، لە چەند تێکشکانێکی ئاسایی پێ پەسەندترە.

بەگشتی سەرکردەی سەرکەوتوو، فرۆشیارێکی زیرەکە.. بەرنامەڕێژیو بیرۆکەکانی، بە سەرۆکەکانی دەفرۆشێت، هەروەها ژێردەسەکانیشی، پێیان ڕازی دەبن.

# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

■ ن: عبدالله العثمان و: جەلال عەبدوڵڵا

## ٤١- خۆشحاڵو سەرکەوتوو بە

دڵتەنگیو کێشە، دەبێت بەهۆی ماندووبوونی مرۆڤ، لەدەستچوونی کاتو تواناو چالاکییە زۆرەکەی، خۆشحاڵیو گەشبینی لە ژیان بۆ مرۆڤ ئاسان دەکات، هەلی پێ دەبەخشێت بۆ بیرکردنەوە، داهێنانو بەرهەمهێنان، کاتێک مرۆڤ هەست بە خۆشحاڵی دەکات، دەتوانێت بەخۆیو خەڵکی ببەخشێتو بەرهەمدار بێت، هاوبەشی دەکات لە خۆشحاڵکردنی دەوروبەرەکەی، لە دڵەوە دەبەخشێت، هاوبەشی دەکات لە باشترکردنی ژیان لەم جیهانەدا، کاردەکات لە هاوبەشیکردن لەکارەکەی، لەماڵەوە، کاریگەری لەسەر کەسە نزیکەکانی دادەنێت.

## ٤٢- ڕۆژووگـرتن

ڕۆژووگرتن پەرستشێکە، خودا ڕازی دەکاتو پاداشتەکەشی لای خۆیەتی، پڕە لە دڵسۆزی، هیچ کەسێك بەڕۆژووەکەت نازانێت، هەروەها بۆلەشو تەندروستیمان بەسوودە، کاتی خواردنت بۆ دەهێڵێتەوە، یەکجار نان دەخۆیت، نزاکانمان تێیدا گیرا دەبن، هەست بە خۆشیو کاریگەریی ڕۆژوو ناکرێت، مەگەر کەسێك ئەنجامی دابێتو بۆ ماوەیەك بەردەوام بووبێت لەسەریو حەزی لێ بێت. هۆیەکە بۆ پتەوبوونی پەیوەندی، لەگەڵ ئەو کەسانەی خۆشت دەوێن بەربانگ دەکەیتەوە، بانگهێشتی خەڵکی دەکەیت بۆ نانخواردن، ئەوانیش ڕۆژوو دەگرن، خێری ئەوانیش بەدەست دەهێنیت.

## ٤٣- سبحان الله وبحمده

لە ئیبن عەباسەوە لە جوەیرییەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، لە مزگەوت چووە دەرەوە، ئەو لە مزگەوت بوو، کاتێك بۆ چێشتەنگاو گەڕایەوە فەرمووی: هێشتا لەسەر ئەوبارەی کەتۆم تێیدا جێ هێشت، گوتی: بەڵێ، خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: لەدوای تۆ، چوار وشەم گوت، سێ جار دووبارەم کردەوە، ئەگەر کێشانەت بکردایە، بەرامبەر بوو بەوەی تۆ کردووتە، ((سبحان الله وبحمده عدد خلقه ورضا نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته)) (رواه مسلم).

پێشەوامان فێرمان دەکات، ئەو کارانە بکەین، کە کاتو تواناکانمان بەبەرەکەتو بەرهەمدار دەکەن، بۆیە نزاو پاڕانەوە، بەرامبەرە بەچەند کاتژمێر خوداپەرستی، پێویستە بیر بکەینەوە، لەوەی بەرهەمی گەورەو مەزنی هەیە، ئەم سەردەمەی ئێستا سەردەمی دەستکەوتە گرنگەکان نییە، بەڵکوو سەردەمی دەستکەوتە گرنگترینەکانە!

## ٤٤- کارێك ئەنجام بدە، کە حەزت لێیە، یان حەز بکە لەوەی کە ئەنجامی دەدەیت.

زۆرێـك لە خەڵکی کاتێك پرسیارکارەکەیان لێ دەکەیت، دەست دەکەن بە پرتەوبۆڵە، لە کارەکەیان ناڕازینو حەز ناکەن بەردەوام بن لەسەری، چۆن چاوەڕێی بەرهەمو سەرکەوتن لە کەسێکی وا دەکەیت. تۆ دەبێت کارێك ئەنجام بدەیت کە حەزت لێیەتیو لەگەڵ کەسایەتیت دەگونجێت، یان حەز لەو کارە بکە کە ئەنجامی دەدەیت، کارەکەت بخەرە نێو بازنەی گرنگی پێدانەکانت، یان چێژی لێ وەربگرەو لات گرنگ بێت، بەجۆرێك ببێتە مایەی خۆشحاڵبوونت، کارەکەت وەك گۆڕەپانی داهێنان سەیر بکە، یان وەك هەلێك بۆ سوودو گۆڕانکاری، کارەکەت بکە بەچێژو سوودوەرگرتن، لە شوێنێکدا کار بکە خۆشیت لێی بێتو بەردەوام بە لەسەری.

## ٤٥- بەرەنگاری شکست بەرەوە

کاتێك دەستەوسان دەبیت لەبەردەم شکستدا، دەکەویتو هەڵناسیتەوە؛ ئەوا تۆ ژیانی خۆت لەنێو دەبەیت، باشترین کات بۆ هەستانەوە، ڕاستەوخۆ دوای کەوتنە، ئەگەر ئازار چەشتنت زیادکرد؛ ئەوا ئازارەکە زۆرترو توندتر دەبێت، سارێژبوونەوەی ئاسان نابێت، پێکەنینو هەستانەوەی منداڵ نابینیت لەپاش برینداربوونی، تەوبەکردنیش بەهەمان شێوە، باشترین پاشگەزبوونەوە، ڕاستەوخۆ دوای تاوان دەکرێت، هەروەك ئیبنو قیم دەڵێت: دەبێت پەشمان بیتەوە لەتاوان، ئەگەرچی درەنگیش بێت..





# پلان

## کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

سامان کەریم

**قۆناغی یەکەم:** دابەشکردنی کاتی ڕۆژانە، بە جۆرێك کە هەر لەڕووی کاتەوە، پلانەکە بە ماوەیەکی کەم کۆتایی پێ بێتو ببێت بە خاڵێکی ئەرێنی بۆ شێوازی کارکردن. واتە: هەر کارمەندێك ڕۆژانە لە کاتژمێر چەند بۆ چەند دەوام بکات. واتە: کاتی فەرمی کارکردن.

**قۆناغی دووەم:** شێوازی کارکردنی کارمەندان، واتە: کارمەندان چی بکەنو چۆن کاربکەن؛ بۆئەوەی پلانەکەمان سەرکەوتوو بێت.

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، کە سێ ڕێگامان هەیە بۆ میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەم پلانە. بۆیە ئەم دوو قۆناغەش لەبەر ڕۆشنایی ئەو سێ ڕێگایە شی دەکەینەوە، واتە:

**یەك:** شێوازی کارکردن بۆ ڕێگای یەکەم (ڕێگای پێدانی فۆڕمی زانیاریو پڕکردنەوە):

**قۆناغی یەکەم:** دابەشکردنی کات بۆ ئەم قۆناغە، نەشکرێت ئاساییە؛ چونکە ماوەکەی کەمی پێ دەچێت، واتە: کارکردن بۆ ئەم قۆناغە، وەك کارکردنی ئاسایی بەڕێوەبەرێتییەکان دەبێت، بەشێوەیەك بێت کە کارمەند هیلاك نەکات، لە کاتژمێر (٨:٣٠) خولەکی بەیانی بۆ (٤) ئێوارە.

**قۆناغی دووەم:** شێوازی کارکردنی کارمەندان لە هەر وێستگەیەك، بەم شێوازەی خوارەوە دەبێت:

فۆڕمی زانیاری، تەنها دەدرێت بە سەرۆکخێزان، نەك ئەندامی خێزان؛ بۆئەوەی ژمارەی خێزانانی ناوچەی نیشتەجێبوونی ناوچەکان، بە شێوەیەکی سەرەتایی بزانین، ئەمەش بەهۆی کۆبوونی خۆراكو ناسنامەی باری کەسێتی دەزانرێت، کە ئەو هاوڵاتییە سەرۆکخێزانە.

ناوی هەر سەرۆکخێزانێك بەو شێوازەی ئاماژەمان پێ کرد، تۆمار دەکرێت لە لیستی تۆماردا.

دوای پڕکردنەوەی فۆڕمی زانیارییەکانو گێڕانەوەی کارمەندێك، یان دوو کارمەند بۆ ڕاستیو درووستی زانیارییەکان پشکنینی تەواو بۆ هەر خێزانێك دەکاتو هەر کێشەیەك هەبوو، چارەسەر دەکرێت.

**دوو:** شێوازی کارکردن بۆ ڕێگای دووەم (ڕێگای پشکنینی زانیاریو پێداویستی هاوڵاتیان):

**قۆناغی یەکەم:** دابەشکردنی کات بۆ ئەم پشکنینە، وەك کاتی ئاسایی بەڕێوەبەرێتییەکان دەبێت، بەڵام گەر هاتوو بمانەوێت ئەم پلانە بە ماوەیەکی کەم جێبەجێ بکەین؛ ئەوا پێویستە شەفتی کارکردن زیاد بکەین. واتە: دوو شەفت کاری لەسەر بکرێت؛ بۆئەوەی ماوەی جێبەجێکردنی پلانەکە، کەم بێتەوە بۆ دوو ئەوەندە، لەبەرئەوەشی نازانین ئەم پشکنینە چەندی پێ دەچێت، مانگێکی پێ دەچێت، یان زیاتر. بۆیە دەبێت لە سەرەتاوە سەیری بەڕێوەچوونی کارەکان بکەین، گەر بەشێوەیەکی خێرا کارەکان بەئەنجام گەیشت؛ ئەوا یەك شەفتی کارکردن باشە، ئەگەر نا؛ ئەوا دەبێت بکرێت بە دوو؛ بۆئەوەی گەر بەخەمڵاندن سەلمێنرا، ئەم پلانە بە دوو ساڵ جێبەجێ دەبێت، ئەوکات بە یەك ساڵ بتوانین جێبەجێی بکەین؛ چونکە کاتەکەی دەکەوێتە سەر پڕکردنەوەی زانیارییەکان لەلایەن هاوڵاتییانەوە، گەر هەڵەی زۆر کرابێت، یان چەندین زانیاری، بەئەنقەست هەڵەی تێدا کرابێت؛ ئەوا کاتەکە زیاتر دەخایەنێت.. هەروەها چڕیی دانیشتوانی ناوچەکان هۆکارێکی ترە بۆ دیاریکردنی ئەم کاتە، کە چەندی پێ دەچێت.

**قۆناغی دووەم:** کاری کارمەندان بۆ ئەم قۆناغە بریتییە لەم خاڵانەی خوارەوە:

دەبێت نەخشەی ناوچەی نیشتەجێبوونی هەر ناوچەیەك لەڕێگای شارەوانییەوە وەربگیرێت، یان بەشێوەیەکی نزیکەیی، نەخشەی ئەو

ناوچەیە بکێشرێت؛ بۆئەوەی بزانرێت چەند ماڵ لەو ناوچەیەدا هەن.

کارمەندان لەم قۆناغەدا، بەشێوەیەکی مەیدانی کار دەکەن، ماڵ بەماڵو هەر کارمەندێك سنوورێك بۆخۆی دیاری دەکات، بۆ نموونە: چەند ماڵێك، دوای تەواوبوونی هەر ماڵێك، لەسەر نەخشەی ئەو ناوچەی نیشتەجێبوونە، ماڵەکە ڕەش دەکاتەوە، وەك ئاماژەیەك؛ تا بزانرێت چەند ماڵ تەواو بووەو چەند ماڵ ماوە لەو ناوچەیەدا.

هەموو ئەو کارمەندانەی کە لەم بەشەدا کار دەکەن، کاریان تەنها ڕاستکردنەوەی فۆرمی زانیارییەکانە لە هەموو ڕوویەکەوە.

هەر ئەندامێکی خێزان، لە ماڵ نەبوو لە کاتی پشکنیندا دەبێت بۆ پشکنینی زانیارییەکانی، بچێتە وێستگەی شوێنی نیشتەجێبوونەکەی، کە سەرۆکخێزان زانیارییەکانی لێ وەرگرتووە، ئەگەرنا؛ ئەوا ئەو کەسە مافی هاوڵاتیبوونی نابێت، تاکو ڕاستی زانیارییەکانی نەسەلمێنێت.

پێش وەخت هەموو خێزانەکانی ئەو ناوچانە، ئاگادار دەکرێنەوە کە چ کات دەست بەپشکنینی زانیارییەکان دەکرێت.

سێ: شێوازی کارکردن بۆ ڕێگای سێیەم (ڕێگای داخڵکردنی زانیارییەکانو دروستکردنی ئامارەکە).

قۆناغی یەکەم: بۆ ئەم ڕێگایە، دەتوانین شەفتی کارکردن بکەین بە دوو شەفت؛ بۆئەوەی بە زوترین کات ئامارەکە دروست بکەین، بەڵام دەبێت هەموو ئەو کارمەندانەی کاریان پێ دەکەین، شارەزای ئەو بەرنامەیە بن، کە ئامارەکەی پێ دروست دەکەین.

قۆناغی دووەم: کاری کارمەندان بۆ ئەم ڕێگایە، بریتییە لەم خاڵانەی خوارەوە:

ئەو کارمەندانەی کە لەم ڕێگایەدا کار دەکەن، دەبێت شارەزاو لێهاتوو بن لە بەرنامەی بەکارهاتوودا.

دەبێت کارمەندان پەیوەست بن بەو کاتەی بۆیان دیاری کراوە؛ چونکە لەسەر بنەمای کات، دەتوانین بزانین، ئەو پلانە چەندی پێ دەچێت.

دەبێت پێداویستیی تایبەت بۆ کارمەندانی ئەم ڕێگایە ئامادە بکرێت، کە گرنگترینیان بریتییە لە کۆمپیوتەر؛ لەبەرئەوەی ئامارەکەی پێ دروست دەکەین، کە دواتر هەر کۆمپیوتەرێك دەکرێت بەناوی کارمەندەکەوە، دەکرێتە بەرپرسی سەلامەتیی کۆمپیوتەرەکە. دەشبێت تایبەتمەندیی کۆمپیوتەرەکە بەرز بێت؛ بۆئەوەی کارەکەمان زۆر باش بێت.

### مەبەستمان چییە لە کارمەندی پێویست؟

مەبەستمان پێی ئەوەیە، چەند کارمەندمان دەوێت بۆ تەواوی پلانەکە، کە بەسەر سێ ڕێگادا دابەشمان کرد. دابەشکاریش بۆ هەر سێ پارێزگاکە، بەپێی سنووره سەرەکییەکانو لقەکان دەکەین، واتە: بەپێی نەخشەی جوگرافیی هەر پارێزگایەك، وێستگەی سەرەکی بۆ ناوچەکان دیاری دەکەین.

دابەشکاریش بەپێی سێ ڕێگای کارکردن ناکەین؛ بۆئەوەی لێتان ئاڵۆز نەبێت، بەڵکوو بەم شێوازەی خوارەوە دابەشکاری دەکەین بۆ ئاسان تێگەیشتن:

یەکەم: ستافی هەرێمی (هەرسێ پارێزگا)
دووەم: ستافی پارێزگا
سێیەم: وێستگەی سەرەکی
چوارەم: وێستگەی لاوەکی
پێنجەم: وێستگەی گەڕەکەکان

### یەکەم: ستافی هەرێمی (هەرسێ پارێزگا)

مەبەستمان لەم ستافە چییە؟

مەبەستمان پێی ئەوەیە، ستافێکی کارا لەهەر سێ پارێزگاکە پێك دەهێنین، بۆ هەرێمی کوردستان کە سەرپەرشتی تەواوی پلانەکە بکات، چاودێریش دەبن بەسەر کاری ستافی هەر پارێزگایەکەوە، هەر ئاستەنگێکیش دروست بوو، لەم ڕێگایەوە بگەیەنرێت بە وەزیری پلاندانانو بەزوترین کات چارەسەر بکرێت.

### دووەم: ستافی پارێزگا

مەبەستمان لەم ستافە چییە؟

مەبەستمان پێی ئەوەیە ستافێکی کارا لەهەر پارێزگایەکدا پێك دەهێنین، کە سەرپەرشتی کاری پارێزگاکان دەکەن، چارەسەری هەرکێشەیەك دەکەن، کە لە ئاستی پارێزگاکاندا دروست دەبێت، گەر چارە نەکرا، کێشەکە ڕەوانە دەکرێت بۆ ستافی هەرێمی بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها بەردەوام چاودێریی وێستگە سەرەکییەکان دەکات، کە کاروباریان بە چ شێوازێك دەڕوات.

### سێیەم: وێستگەی سەرەکی

مەبەستمان لە وێستگەی سەرەکی چییە؟

مەبەستمان پێی ئەو وێستگانەن کە بە شێوەیەکی سەرەکی لە هەر پارێزگایەك دیاری دەکرێن، بەپێی (ناوەندو قەزا)ی هەر پارێزگایەكو هەر کێشەیەك دروست ببێت، گەر چارەسەر نەکرا؛ ڕەوانەی ستافی پارێزگا دەکرێت، هەروەها چاودێری کارەکانی وێستگەی لاوەکی دەکات.

کە بەم ژمارانەی خوارەوە، وێستگەی سەرەکی دیاری دەکەین:

| پارێزگا | ژمارەی وێستگە |
|---|---|
| سلێمانی | ١٢ وێستگە |
| هەولێر | ٧ وێستگە |
| دهۆك | ٦ وێستگە |

### چوارەم: وێستگەی لاوەکی

مەبەستمان لە وێستگەی لاوەکی چییە؟

مەبەستمان پێی، ئەو وێستگانەن کە لە هەر (ناوەندو قەزا)ی پارێزگایەکدا دروست دەکرێن، بەپێی دابەشکاریی هەر یەك لەو ناوەندو قەزایانە بە چەند ناوچەی سنوورییەوە، هەر یەك لەو ناوچە سنوورییانەش، چەند بەش بوون؛ ئەوەندە وێستگە دروست دەکرێتو ئەم وێستگە لاوەکییانەش بەپێی هەر گەڕەکێك، کارمەندی بۆ دیاری دەکرێت؛ بۆئەوەی لەماوەیەکی زۆر کەمدا، بتوانین کارەکەمان جێبەجێ بکەین، بەپێی چڕیی دانیشتوانی هەر ناوچەیەك، کارمەند دیاری دەکەین. واتە: ژمارەی وێستگەکان دابەشکاری هەریەك لە ناوەندو قەزاکان دیاری دەکات، کە دەبن بە چەند ناوچەوە، ئەوەندە وێستگە دروست دەکرێت.

### پێنجەم: وێستگەی گەڕەکەکان

مەبەستمان لە وێستگەی گەڕەکەکان چییە؟

مەبەستمان پێی، هەموو ئەو گەڕەکانەیە، یان هەموو ئەو شوێنانەی کە خەڵکی لێی نیشتەجێ بێت، لە هەموو هەرێمی کوردستاندا کە گوندو ناحیەکانیش دەگرێتەوە، ئەو سنوورانە دابەش دەکرێنەوە بەسەر قەزاو ناوەندی پارێزگاکاندا لەسەر نەخشەو دەیانکەینە کۆدێکی هەشت ڕەقەمی.



وەهاب حەسیب محەمەد
بینگول/ ترکیا

# زانکۆی بینگۆڵو سیستەمی بەڕێوەبردنی

بینکول لە زماندا، واتا هەزارکانی، واتە: ڕاستییەکی زۆری تێدایە؛ چونکە شارەکە ئاوی زۆرە.

پارێزگای بینگۆل دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی تورکیاو بەشێکە لە دەشتی ئەنادۆڵ، بینگۆل وەك شار ساڵی ١٩٤٦ درووست کراوە، ڕووبەرەکەی ٨،٤٠٢ کیلۆمەتر دووجایە، ژمارەی دانیشتووانی ٢٥٣،٧٣٩ کەسە. تێکڕای دانیشتوان کوردنو(٧٠٪)، یان زازان، (٣٠٪)، یان کرمانجن. بەهەرتك زاراوە دئاخڤن.

پارێزگاکە سرووشتێکی شاخاوی جوانی هەیەو زستانی سەختە، بەم هۆیەوە بەرهەمی خۆماڵی زۆرە، لەوانە: شیرو بەرهەمەکانی، میوە بە تایبەت ترێ، هەنگوین کە لە تورکیاو دنیادا، سەدایەکی بەرزو ناسراوی هەیە.

هەروەسا ئاووهەوای بینگۆل زۆر سازگارە، بەتایبەت لە وەرزی بەهارو هاویندا. چەندین شوێنی ناوازە لە پارێزگاکەدا بوونیان هەیە، لەوانە گەرماوی بینگۆل، سەرباری ساردی ئاووهەوای شارەکە، چوار وەرز پلەی گەرمی ئاوەکە لە سەرووی سی پلەی سەدییەوەیە، لە ئێستادا ئەو شوێنە کراوە بە گەرماو زانکۆی بینگۆل بەڕێوەی دەبات. هەروەها دەریاچەیەك لە نزیك شارەکە هەیەو پارچەیەك وشکانی سەرئاو کەوتووە، کە بەردەوام لە جووڵەدایە! واتە: جێگیر نییە، بەم هۆیەوە، بۆتە شوێنێکی گەشتیاریو جێگای چاوتێبڕینی گەشتیاران.

بەرلەوەی پارتی دادو گەشەپێدان دەسەڵات بگرێتە دەست، حکوومەتە یەك لە دوای یەکەکانی تورکیا، زیاتر لە شارەکانی ئەستەمبوڵ، ئەنقەرەو ئزمیر، گرنگییان بە کردنەوەی زانکۆ دەدا، بە دەگمەن بیریان بە لای ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا دەچوو، لە کاتێکدا پارتی دادو گەشەپێدان دەسەڵاتی گرتە دەست، تێڕوانینێکی ستراتیژی بۆ گەشەپێدانی وڵات هەبوو، تێڕوانینەکە بریتی بوو لە گەشەکردنو پێشخستنی ناوچەکانی وڵات بێ جیاوازی. لە سەر ئەو بنەمایە، زانکۆی بینگۆل لە (٢٩/٥/٢٠٠٧)داو بە بڕیاری ژمارە(٢٦٥٣٦)ی پەرلەمان کرایەوە.

بنەمای بیرۆکەی کردنەوەی زانکۆ لە بینگۆل دەگەڕێتەوە بۆ پەیمانگای بەرزی پیشەسازی، کە لە ساڵی (١٩٨٣)دا کرابوویەوەو بەشێك بوو لە زانکۆی فورات لە پارێزگای (ئەلازغ).

لە ئێستادا حکوومەت بە کادری شارەزاو تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو پاڵپشتی زانکۆی بینگۆل دەکات؛ تا لە سەر بنەما نێودەوڵەتییەکانو بەپێوانەی زانستی، بتوانێت ڕکابەری زانکۆکانی دیکەی وڵات بکات.

لە ئەوڕۆدا زانکۆی بینگۆل لە چوارچێوەی (٩) کۆلێژو (٤) پەیمانگادا کارەکانی تەواو دەکات بەم شێوەیە:

**یەکەم: کۆلێژی زانست:** لە چەند بەشێك پێکدێت، لەوانە: فیزیا، بیرکاری، ئامار.

**دووەم: کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان:** بەشەکانی بریتین لە: ئادابی زمانی تورکی، مێژوو، جوگرافیا، شوێنەوار،

کۆمەڵناسیو مێژووی هونەر.

سێیەم: کۆلێژی کارگێڕیوئابووری: کە بەشەکانی ئابووری، کارگێڕی، کارگێڕیی داراییو بانکی، دامەزراوە حکوومییەکان، پەیوەندیی نێودەوڵەتی، زانستە ڕامیارییەکان، کارگێڕیی تەندرووستی لەخۆ دەگرێت.

چوارەم: کۆلێژی زانستە شەرعییەکان: لە چەند بەشێك پێکدێت لەوانە: زانستە شەرعییەکان، فەلسەفەو ئاین، هونەرو مێژووی ئیسلامی، ئاکارو ڕۆشنبیریی ئیسلامی.

پێنجەم: کۆلێژی ئەندازیاری: ئەندازیاریی پیشەسازی، کۆمپیوتەر، ژینگە، میکانیك، ئامادەکردنی نەخشە، ئەندازیاریی خۆراك، بایۆلۆجیو بۆماوەو ئەندازیاریی مەواد.

شەشەم: کۆلێژی ڤێتێرنەری: کە ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت: ڤێتێرنەری، تەندرووستی خۆراكو چاودێریی باخچەی ئاژەڵان.

حەوتەم: کۆلێژی کشتوکاڵ: کە لە بەشەکانی ڕووەکی باخچەکان، ئەندازیاریی کشتوکاڵ، ئەندازیاریی خۆراك، ئابووریی کشتوکاڵو ئەندازیاریی ئامێری کشتوکاڵی پێك دێت.

هەشتەم: کۆلێژی زانستی تەندرووستی: ئەم بەشانە لە خۆ دەگرێت: پەرستاری، چارەسەری سرووشتیو فریاکەوتنی سەرەتایی.

نۆیەم: کۆلێژی گەشتیاری: لە بەشەکانی کارگێڕیی گەشتیاری، کارگێڕیی گەشتە گەشتیارییەکان، ڕێنمایی گەشتیاری، خاوبوونەوە، یان خۆهەڵخستن، خۆدانە بەر خۆر بەتایبەت لە کەناری دەریاکاندا پێکدێت.

زانکۆی بینگۆل لەسەر ڕووبەرێکی فراوان درووست کراوە، بەشێکی زۆری سەوزاییە، سەرباری بینای کۆلێژەکان، دوو بەشی گەورەی حەوانەی بۆ خوێندکاران تێدا درووست کراوە، بەشێکیان وەك بەشی ناوخۆی سوودی لێ وەردەگرێت، ئەویتریان کراوە بە میوانخانە، بە ناوی میوانخانەی زانکۆ، میوانە بیانییەکان لە ڤوتابیانو ئەندامانی وەفدە جۆراوجۆرەکان تێیدا دەمێننەوەو دەحەسێنەوە.

زانکۆی بینگۆل زانکۆیەکی حکوومییە، واتە: سیستەمی بەڕێوەبردن سیستەمێکی مەرکەزییە، تا ئێستا حکوومەت خەرجو پێداویستیی خوێندکاران، مامۆستایانو فەرمانبەرانی دابین دەکات، زیاتر لە دووازدە هەزار خوێندکار لە گشت لایەکی وڵاتەوە بۆ خوێندن ڕوویان لە زانکۆی بینگۆل کردووە. لە کاتێکدا تەنها بە دووسەد خوێندکار دەستی پێ کرد.

شێوازی بەڕێوەبردن، ئیلکترۆنییە، لە ناو تۆمارکردنەوە، تا دەگات بە وەرگرتنەوەی نمرەی ڤوتابیان، تەنانەت چوونە ناو زانکۆ، نانخواردن لە کافتریای زانکۆ، وەرگرتنی کتێب لە کتێبخانە بە شێوازێکی ئیلکترۆنییەوەو لە ڕێگای پێناسی خوێندکارەوە ئیشەکە تەواو دەکرێت.

هەروەها سەرۆکی زانکۆو سەرۆکبەشەکان هەر چوارساڵ جارێك لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دادەنرێنو ئاڵووگۆڕیان پێ دەکرێت. تەنها بۆ دوو خول کەسێك دەتوانێت خۆی کاندید بکات، یاخود کاندید بکرێت، مەرجە سەرۆكو سەرۆکبەشەکان پلەی زانستییان پرۆفیسۆر بێت. ئەو کارەش بە کۆمەڵێك کەناڵی زانستیدا تێپەڕ دەبێت، لەوانە: نووسینی وتار لە گۆڤارە باوەڕپێکراوەکاندا، نووسینەوەی کتێب، گرتنی کۆڕو سیمینار، دواتر هەڵسەنگاندنی کارەکان لە لایەن دەستەیەکی زانستیی بەرز لە بارەگاکەیان لە پایتەخت (ئەنقەرە)یە.

زانکۆ خاوەن پەیجی تایبەت بە خۆیەتی کە زۆر لە چالاکیو ئاگادارییەکانی زانکۆی تێدا بڵاو دەکرێتەوە، تەنانەت خواردنی کافتریا بۆ ماوەی یەك مانگ.. واتە: لەو ماوەیەدا کافتریا جۆرەکانی خواردنی بڵاو دەکاتەوە کە بۆ خوێندکارانی ئامادە دەکات، بە نرخێکی زۆر کەمتر لە بازاڕ دەفرۆشرێت بە خوێندکاران.

زانکۆ خاوەنی کتێبخانەیەکی گەورەیە، بەناوی (سەلاحەدینی ئەیوبی)، بیستو پێنج هەزار پەرتووکی لە بواری زانستە جۆراوجۆرەکان تێدایە، ڕۆژانە جمەی دێت لە سەردانیکەرانی، هەروەسا زانکۆ لە تەك چەند ماڵپەڕێکی زانستییدا بەشداری کردووە، خوێندکاران دەتوانن بێبەرانبەر لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە، پێداویستییە زانستییەکانیان پەیدا بکەن. ئەوکارەش کارئاسانییەکی زۆر بۆ خوێندکاران دەکات، بەتایبەت لە نووسینەوەی توێژینەوەی زانستیدا.

لە هەرێمی کوردستان، زانکۆی بینگۆل پەیوەندی زانستی لەتەك هەردوو زانکۆی (سۆرانو صلاح‌الدین)دا هەیە.

لە کۆتاییدا بە داخەوە دەڵێم: زانکۆکانی هەرێم، لە پێش زانکۆی بینگۆلەوە درووست کراون، تەمەنی زانکۆیەکی وەك سلێمانی، ناستی زانکۆی بینگۆل، نەك بە تەنها لە زانکۆی سلێمانی لە تەواوی زانکۆکانی کوردستان. نیوسەدەی تێپەڕاندووە کەچی بەرزترە، هۆکارەکەی توێژینەوەی دڵسۆزانەو بڕیاری جەسوورانەی دەوێت؛ تا پەنجە لە سەر ناتەواوییەکان دابنرێت، بێگومان سیستەمی بەڕێوەبردن یەکێکە لە نیشانە دیارەکانی ئەو پاشکەوتنە.

ژێدەر: د. زاهیر ئەرتەکی سەرۆکی بەشی زمانی کوردی

د. بەدرەدین باسوغوی/ مامۆستا لە بەشی ئیلاهیات

www.bingol.ed.tr

تێبینی: زۆرێك لە زانیارییەکانی مامۆستایان کورتکراوەتەوەو بە شێوەی ڕاپۆرت داڕێژراونەتەوە.

بە کورتی: شاری بینگۆل یەکێکە لە هەشتاو دوو پارێزگاکەی وڵاتی تورکیاو دەکەوێتە دەشتی ئەنادۆڵەوە، ڕووبەری خاکەکەی: ٨،٤٠٢ کم٢ ژمارەی دانیشتووانی زیاد لە دووسەدو پەنجاهەزار کەسە، سرووشتی شارەکە شاخاویەو زستانی سەختە، ناوچەکە سرووشتێکی جوانو دەگمەنی تێدا هەڵکەوتووە، گەرماوی بینگۆل، دوورگەی جووڵاو، شارەکە یەکێکە لە دیاردە کەموێنەو دەگمەنەکانی دنیا، دوورگەیەك لە ناو دەریاچەیەکدا هەڵکەوتووە، هەمیشە لە جووڵەو گەڕاندایە، بەهۆی سرووشتی شارەکەوە بەرهەمی خۆماڵی لەو شارەدا گەلێك زۆرە، لەوانە شیرو بەرهەمەکانی، هەنگوین بەشێوەیەکە لە وڵاتی تورکیادا هەنگوینی بینگۆل ناسراوە.

(نێتۆرک مارکێتینگ)

و: ئانا هەورامی




## سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا

## وەڵامدانەوەی بیانووگەلی باو

وەڵامدانەوەی بیانووگەلی باو «بەرگی شەڕ بپۆشە»

سەرکەوتن لە ژیاندا، کارێکی سادەیە! چونکە ٩٥٪ی ئەو کەسانەی ڕۆژانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەیت، کەسانێکن کە بەنەرێنی بیر دەکەنەوە. پێویستت بە چاودێرییەکی ئەوەندە زۆر نییەو هەر ئەوەندە بەسە کە لە گرووپی ٥٪ی ئەو کەسانەدا بیت، کە بەنەرێنی بیردەکەنەوە. بەهەرحاڵ، پێویستە وەڵامی بیانوو پرتەو بۆڵەکانی ئەو ٩٥٪ کەسەی لە دەوروبەری تۆدان بدەیتەوە. ئامانجی ئەم بەشە، ئامادەکردنی تۆیە بۆ خۆڕاگری لە بەرامبەر ئەم بیانووانەدا. لەوانەیە بەلاتەوە سەیر بێت، بەڵام خراپ نییە، بزانیت کە زۆربەی ئەم بیانووانە، لە کەسانی نزیکتەوە دەهێنرێنەوە، ئەمەش سرووشتییە. ئەمە، نەك لەبەر ئەوەبێت کە ڕقیان لێت بێت، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە، زانیارییان لەبارەی بازرگانی NMەوە نییە.

لە وەڵامدانەوەی بیانووەکاندا، ئێمە بە دوای کێشەو گرفت لەگەڵ کەسانی ترداو سەلماندنی ئەوەی کە ئەوان هەڵەدەکەن، نین. مەبەستی ئێمە، بەخشینی زانیاریی پێویستە، بە ئەوان بۆ دانی بڕیارێکی باشتر. لەم بەشەدا، من چەند بیانوویەکی بێجێ، کە لەوانەیە لە کاتی چالاکییەکانتدا لە NM لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو ببنەوە، باس دەکەمو ڕوونکردنەوەیەکی سادە بۆ چۆنێتی وەڵامدانەوەیان دەخەمە بەردەست.

### ١- ئەم کاری پێکهاتە هەرەمییە/ نایاساییە.

هەروەك لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، هەر پێکهاتەیەکی هەرەمی لە بنەڕەتدا چوار تایبەتمەندی هەیە:

١. هیچ جۆرە بەرهەم، یان خزمەتگوزارییەك لەلایەن کۆمپانیاوە نمایش ناکرێت.

٢. بەرهەمەکان، یان خزمەتگوزارییەکان بە نرخێکی زۆر دەفرۆشرێن؛ تا کۆمپانیا توانای دانی پارەی کرێو نمایشە سەرنجڕاکێشەکانی ئەندامانی هەبێت.

٣. بۆ ڕاکێشانی زیاتری کەسەکان، پێویستە «وریایی»بکرێت.

٤. بۆ ئەو کەسانەی کە درەنگتر ڕوو دەکەنە کارەکە، ڕێی تێ ناچێت لەڕووی پێگەوە داهاتەوە، لەو کەسانەی کە لە پێش ئەوانەوە هاتوونەتە ناو کارەکەوە پێش بکەون.

هەرکام لەم چوار تایبەتمەندییە بەسە، تا شێوازی کۆمپانیایەك بە «پێکهاتەی هەرەمی» بگۆڕێتو پێگە یاساییەکەی بگۆڕێت. کۆمپانیاکانی NM زۆربەی کات لەلای یەکێتیی فرۆشیاران، ڕاستەوخۆ مۆڵەت وەردەگرن. ئەو کۆمپانیایانەی کە مۆڵەتو پشتگیری پێویستیان لەلایەن ئەم یەکێتییانەوە، یان سەردانیکەری خاوەن ڕایان هەبێت، بە بەشێك لە کۆمپانیا ڕێپێدراوەکانی NM ئەژمار دەکرێن.

### ٢- بەرهەمەکان زۆر گرانن؛ چونکە پێویستە کۆمپانیا پارەیەکی زۆر بە کڕیارەکانی بداتەوە

لە نێتۆرکی مارکێتینگدا، نرخی کاڵاکان زۆر زیاترە بە بەراورد لەگەڵ وردەفرۆشەکاندا کەمترە؛ چونکە لە NM، خەرجیی بازاڕخستن بە کەمترین ئاستی ڕێتێچوون دەگات. بابەتی ڕیکلامەکانی هیچ خەرجییەکی ناوێت. بەرهەمەکان بە شێوازی دابەشکردنی خۆماڵی، واتە: لە کەناڵە ئاساییەکانی دابەشکردن هەروەك جوملەفرۆشی، دەلیلەکان، وردەفرۆشیو شتەکانی ترەوە نافرۆشرێت. ڕەنگدانەوەی ئەم دەستپێوەگرتنانە لە خەرجیدا، بە شێوەی کەمکردنەوە، ڕووبەڕووی بەکارهێنەر دەبێتەوەو بەشێوەی دەڵالیش ڕووبەڕووی بەکارهێنەرە هەمیشەییەکان دەبێتەوە.

## ٣- تۆ بۆ کەسانی سەرووترت کار دەکەیتو دەوڵەمەندیان دەکەیت

NM بازرگانـــی خـــودی تۆیـــە. لەبەرئـــەوە بـــە ئەنـــدازەی کۆششەکەت داهات بەدەســـت دەهێنن. بەرپرسەکانت برێکی زۆر کـــەم لە بازرگانییەکەت ســـوود وەردەگرن. ئەم ســـوودەش لەبەر بانگهێشتی تۆیە بۆ ئەم بازرگانییەو یارمەتیدانو فێرکردنتە.تۆش لە بەرامبەر ناساندنی کڕیارانی کۆمەڵەکەت بە ئەم بازرگانییەو یارمەتیدانیان پارەیەك بەدەست دەهێنیت. نێتۆرکی مارکێتینگ پێگەیەکی بردنەوە-بردنەوە، یان براوەیی- براوەیییە بۆ هەموو کەســـەکان. لە زۆربەی کاتەکاندا، ئەم بەرپرسانەن کە بۆ تۆ کار دەکەن؛ چونکە ئەوان نەفەســـی کۆتاییش فێری تۆ دەکەن، هەتا ســـەرکەوتوو ببن. دیارە ســـەرکەوتنی ئەوانیش لە گرووپەکەدا، سەرکەوتووکردنی تۆیە.

## ٤-خۆشم لە کاری فرۆشتن نایەت

ئەم بازرگانییە تەنها لەســـەر فرۆشـــتن نەوەستاوە. زۆرینەی نێتۆرك مارکێتەرە ســـەرکەوتووەکان فرۆشـــیار نین. لە ڕاستیدا، زۆرینەی فرۆشـــیارەکان، ئەگەر ئاراســـتەی دیدگایان لە بەرامبەر NM نەگۆڕن، ناتوانن ســـەرکەوتوو ببـــن.NM بازرگانییەکە کە جیاوازیی زۆری لەگەڵ بازرگانی ئاســـاییو فرۆشـــتنی بەرهەمدا هەیە. لە NM،ئێمە لە پلەی یەکەمی بەکاربەری بەرهەمەکانداینو ئەزموونەکانمان دەگوازینەوە بۆ ئەو کەســـانەی کە دەیان ناسین. ئێمە بەرهەمەکان، یان ئەو خزمەتگوزارییانەی کە ســـوودیان لێ وەردەگریـــن، ئەوانە بەســـوودو داهاتهێنەر دەزانین بۆ کەســـانی تریشیان پێشنیاز دەکەین. ئەم کارە لەگەڵ کاری فرۆشیارێکدا کە بە شێوەیەکی گشتی، هیچ کاتێك خۆی بەکارهێنەری ئەو کاڵایانە نییە، جیاوازە. لە NM ئێمە زۆربەی کات سەردانی کڕیارەکانمان دەکەینو بەدواداچوونیان بۆ دەکەین.

ئێمـــە هەموومـــان بە فرۆشـــیاری لەدایك دەبیـــن. ئەگەر بە دروونـــتی بیـــر لـــەم بابەتە بکەینـــەوە، ئێمە ڕۆژانـــە لە حاڵی فرۆشـــداین. جیاوازی لێرەدایە کە لە بەرامبەر فرۆشتنەکەماندا هیچ داهاتێکمان بە نسیب نابێت. ئەگەر تۆ بڕۆیت بۆ ڕێستۆرانێکی باش، بۆ هاوڕێکانیشی پێشنیاز دەکەیت. هەروەها ئەگەر فیلمێکی باش ببینیت، یان کتێبێکی باش بخوێنیتەوە، بۆ ئەو کەسانەشـــی پێشنیاز دەکەیت، کە دەیانناسیت. ئەم کارەش جۆرێکی فرۆشتنە، بەڵام بەبێ هیچ جۆرە داهاتێك بۆ تۆ.

## ٥- کاتم نییە..

زۆر کات خەڵکـــی ئەم بیانووە بـــەکار دەهێنن؛ بۆ هەڵهاتن لە بڕیاردان بە ئاراســـتەی چوونە ناو کارەکەوە. کات تەنها شتێکە کە هەمووومان بە شێوەیەکی یەکسان هەمانە. چ هەژارو چ دەوڵەمەند. تـــۆ هەر شـــەوو ڕۆژێـــك ٢٤ کاتژمێـــر کاتت هەیە، نـــە زیاترو نە کەمتـــر. ئێمـــە کاتێکی ســـنووردار تایبەت دەکەین، بـــەو کارانەی کە لە پێرســـتی ئەولەویەتی ئێمەدان. وەکوو کار، خۆشـــگوزەرانی، لەگەڵ خانەوادەدابوونو شتی تر. ئەگەر دروستکردنی کۆمەڵە لە NM لـــە ئەولەویەتی ئێمەدا نەبێـــت، هیچکات کاتێکی بۆ تایبەت ناکەیـــن. لەبەرئەوە، ڕێـــکاری مامەڵەکردن لەگەڵ ئاوا کەســـێکدا، ئەوەیـــە کـــە ســـوودەکانی NM نیشـــان بدەینو ئـــەوەی کە بە چ شـــێوەیەك دەتوانێت بە تەرخانکردنی بەشێك لەکاتی بە NM بۆ دروســـتکردنی کۆمەڵەکەی لە ئایندەدا، بە ئامانجو ئارەزووەکانی بگات.

چەمکـــی بەرزبوونەوەی کات، لە ڕێگەی NM نیشـــانی بدەیت. هەروەهـــا جیاوازی نێوان ئاوهێنان بە ســـەتڵێكو ڕاکێشـــانی بۆری بۆ ئاوهێنانی ڕوون بکەیتەوە. یەك کارمەند تەنانەت کەســـێك کە بۆ خۆی کار دەکات، لە ڕاســـتیدا بە ســـەتڵ ئاو دەهێنێت؛ چونکە خەریکە کات لەگەڵ پارەدا ئاڵوگۆڕ پێ دەکات. لەوانەیە سەتڵەکەی ئەو گەورەتر بێت لە ســـەتڵی کەســـانی تر، بەڵام تەنها بەوەی کە نەتوانێـــت بڕواتە ســـەر چاوەکـــەو ئاو بۆ خانەوادەکـــەی بهێنێت، ئیتـــر ئاوێك لە کاردا نابێت. داهات بە پێی چالاکیی ئەو دەبێت.لە نێتۆرکی مارکێتینگدا، کەســـەکە هێڵێکی لوولەیی درووست دەکات. تەنانەت ئەگەر هێڵی لوولەکە بچووکیش بێت، ئیتر پێویست ناکات بۆ فەراهەمکردنی ئاوی خانەوادەکەی بە زەحمەت خۆی بگەیەنێت بە ســـەرچاوەی ئاوەکە. هەرکات هێڵی لوولە ئامادەبێت، ئاوی پێدا دێـــت، تەنانەت بۆ نەوەکانی دواتریش. ئەمە هەمان ئەو چەمکەیە کە لەژێر ناونیشانی داهاتی تێکەڵدا باسمان دەکرد.

## ٦- ئەمە کارێکی پارتتایمە کە بەکەڵکی ژنانی ماڵەوە دێت

زۆرینەی ئەو کەســـانەی کە لە NM تێ نەگەیشـــتوون، وا بیر دەکەنـــەوە کە ئەمە بازرگانییەکی کەمبایەخە، کە بە کەڵکی ژنانی ماڵەوەو کەســـانی بێکار دێت. ئەمە بۆچوونێکی نادرووستە لەبارەی ئەم بازرگانییەوە. ڕاســـتییەکەی ئەوەیە، کـــە نێتۆرکی مارکێتینگ ئێســـتا بە ناونیشـــانی گەورەترین دەرفەتی بازرگانـــی، بە درێژایی مێژووی دونیا ناســـراوە. کەسانی وەکو دکتۆر چارلز کینگ، ڕۆبەرت کیوساکی، زیگ زیگلار، بۆرك هوج، جۆن میلتۆن فۆگ، ڕیچارد پۆو جۆن ماکنوچو کەســـانی تریش، پشـــتگیری لەم کارە دەکەن. ئەمانە نووسەرانی بەناوبانگو ڕاوێژکارانی بازرگانیی سەرکەوتوون. ئێستاش NM لـــە هەندێك لە کۆلێژو زانکۆکانـــی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا دەخوێنرێت. لەمڕۆدا زۆر بازرگانو پســـپۆڕی تریش هەن، کە NM بەشـــێوەی پـــارت تایم، یان تەواوی کات ئەنجـــام دەدەن. زۆرینەیان داهاتی ملیۆن دۆلارییان هەیەو لە ژیانێکی زۆر خۆش چێژ دەبەن. ئەمانە بە وتەی پرۆفیسۆر چارلز لیگ"پیشەوەرانی مۆدێرن"ن.

## ٧- لە بارودۆخی ژیانم ڕەزامەندو خۆشحاڵم

ئەم کەســـانە لە ناوچەی هێمنی خۆیاندا ژیان بەسەر دەبەن. لەوانەیە ڕازیکردنی ئەوانە، کارێکی ئاسان نەبێت، بەڵام ئامانجی بنەڕەتـــی، پێدانـــی زانیاریـــی زیاتـــرە پێیان؛ هەتـــا یارمەتییان بدرێـــت بڕیارێکی ژیرانە بدەن. لەبارەی خەونەکانیان قســـەیان لەگەڵدا بکەو چەمکـــی بەرزکردنەوەو داهاتی تێکەڵیان بۆ ڕوون بکەرەوە.جەخت لەســـەر سوودەکانی یارمەتیدانی کەسانی تریش بکەرەوە. گرنگترین خاڵ ئەوەیە، کە پەیوەندییە باشەکانی خۆت لەگەڵیاندا بپارێزیت. لە بیرت بێت کە «نا» واتە؛ ئێستا «نا».

ئەمانـــە بەشـــێك لـــەو بیانووانەن کە تۆ، یان هـــەر نێتۆرك مارکێتەرێکـــی تر ڕووبەڕوویان دەبێتـــەوە. لەوانەیە بیانووگەلی تریش هەبن، کە تۆ ڕووبەڕوویان ببیتەوە. شـــێوازی وەڵامدانەوە بە بیانووەکان، چوونیەكو جێگیرن. هیچکات بە دوای سەلماندنی ڕاســـتبوونی خۆتو هەڵەبوونی ئەوانەوە مەبە. ئەم بیانووانە بە ڕەفتارێکی پەســـەند وەڵام بدەنەوە. زەردەخەنە بکەن، سەرت بە ئاماژەی پشتڕاســـتی ڕابوەشـــێنەو مۆڵەت بدە ئەوان زیاتر قســـە بکەن. هەمیشـــە ئەوەت لە بیر بێـــت، ئامانجی بنەڕەتی، پێدانی زانیاریی گونجاوە پێیان؛ هەتا لە بڕیارێکی ژیرانەدا، یارمەتییان بدەیت.



# کامتان پادشان؟

پەیام

لە دێر زەمـانـدا، ڕاوچییەك هـەبـوو، هەموو ڕۆژێـك بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی خۆیو خانەوادەکەی، دەچووە نێو دەریاو چەند ماسییەکی ڕاو دەکردو دەیبرد بۆ بازاڕو دەیفرۆشت، بە پارەکەی پێداویستییەکانی ژیانو خۆراکی دەکڕی، ڕۆژێك لە کاتی ڕاوکردندا، لەو کاتەی کە لە نێوەڕاستی دەریادا بوو، بایەکی بەهێز هەڵی کردو نزیك بوو بەلەمەکەی تێك بشکێنێت، ڕاوچییەکە لێزانانە هەوڵی خۆکۆنترۆڵکردنی داو ئاراستەی بەلەمەکەی بە هاوشێوە ئاراستەی باکە جووڵاند، ئەو ڕۆژە بۆ ڕاوچییەکە زۆر سەخت بوو، هەرچەندە هاواری دەکرد، هیچ کەس نەبوو، بە هاوارییەوە بێت، ڕاوچی لەو بڕوایەدا بوو، کە ئەوە دوارۆژی ژیانییەتیو لە دواساتەکانی تەمەنیدایە، هاوکات بەدەم شەپۆلەکانی ئاوەکەوە، ململانێی لەگەڵ ئاوەکەدا دەکرد، وەکوو ئەوەی نیشانی بدات، تا ئەو کاتەی دەتوانێت، بەئاسانی تەسلیمی مەرگ نابێت، لەو ساتەدا چاوی کەوت بە دوورگەیەك کە چەند سەد مەترێکی مابوو، پێی بگات، هەرچۆنێك بێت خۆی گەیاندە دوورگەکە، لە بەلەمەکەی دابەزیو بەلەمەکەی بە درەختێکی نزیك کەناراوەکەوە بەستەوە، پاشان دەستی کرد بە گەڕان، بەو هیوایەی شتێك بدۆزێتەوە، بیخوات.

لەناکاو کەوتە نێو ئاپۆڕای جـەمـاوەرەوە، هەموو خەڵكی دوورگەکە لەو کاتەدا کۆببوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی پادشای جەنگاوەریان دەکرد؛ تا بێتو هاوکارییان بکاتو ببێتە پادشایان، لەو کاتەدا کە چاویان بەڕاوچی لێقەوماو کەوت، هەموو پێکەوە هاواریان کرد: پادشای جەنگاوەر هات، یارمەتیمان پێگەیشت!

هەر چەندە ڕاوچییەکە، نەیدەزانی چی ڕوودەدات، بەڵام ئەوان بە پێشوازییەکی گەرمەوە، بەرەو مەیدانی ئاهەنگەکەیان بـردو ئاهەنگی پێشوازییان بۆ سازکردو جۆرەها خواردنی بەتامییان پێشکەش کردا

کاکی ڕاوچـی لە خۆشیدا نـەیـدەزانی ئەمە خـەونـە، یان خەیاڵە، یاخود ڕاستـی.. لە ناکاو لە ڕاوچێتییەوە، بـووە بە پادشای دوورگەیەكو ژیانێکی شاهانە دەگوزەرێنێت، لەبەرئەوە ڕاستییەکەی بۆ باس نەکردن، پێی نەگوتن کە ئەو ڕاوچییە، نەك پادشا!

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، وەکو پادشا حوکمی دەکرد، بەڵام نەیدەزانی مەبەستی خەڵکی دوورگەکە چییە.. لەوەی کە دەیان گوت: پادشای فریادڕەسە!

ژیانی ڕاوچی، بەمجۆرە بـەردەوام بوو، ڕۆژەکان تێپەڕین، ڕۆژێکیان کە جەنابی ڕاوچـی، لەگەڵ خەڵکی دوورگـەکـەدا دانیشتبوون، نانیان دەخواردو بەخۆشی کاتیان بەسەر دەبرد، لەو کاتەدا پیاوێك هاتو پێی گوتن: من پادشای جەنگاوەرم، منم فریادڕەسی ئێوە، خەڵکەکە بەبیستنی ئەم قسانە سەرسام بـوون، هەموان بە سەرسامییەوە بۆ کاکی ڕاوچییان ڕوانـیو چاوەکانیان ئەبڵەق ببوورن، ڕوویان لە ڕاوچییەکە کردو پێیان گوت: کەواتە: تۆ کێیت؟ ئەگەر ئەو کەسە پادشای جەنگاوەرە؟!

ڕاوچییەکە گوتی: نەخێر منم پادشا، ئەو پیاوە درۆ دەکات!

ئیدی خەڵکی سەیری ئەو دووانەیان دەکرد، ئەویان دەیگوت: من پادشام، ئەمیان دەیگوت: نەخێر من پادشام، ئەویان دەیگوت: تۆ درۆ دەکەیت، ئەمیان دەیگوت: نەخێر، تۆ درۆ دەکەیت!

خەڵکی دوورگـەکـە پیاوێکی دانـایـان هـەبـوو، کاتێك بەم مشتومڕەی زانی، گوتی: تاکە چارەسەر بۆ ئەوەی بزانین کامیان ڕاست دەکەن، ئەوەیە کە سبەینێ دڕندەکە هێرش دەکاتە سەر دوورگەکەمان، کام لەم دوو کەسە توانی سەر بکەوێت بەسەریداو بتوانێت دڕندەکە بکوژێت، ئەوەیان پادشایە!

کاتێك ڕاوچییەکە گوێی لە قسەی حەکیمەکە بوو، هاواری کرد: ئەو ڕاست دەکات ئەو پادشای جەنگاوەرە، لە ڕاستیدا من ڕاوچیم لە ڕۆژێکی سەختدا لە دەریا بایەکی بەهێز هەڵی کردو ڕێم کەوتە ئەم دوورگەیە، من پادشا نیم! ئێستاش دەمەوێت بگەڕێمەوە مەملەکەتەکەی خۆم، من پادشا نیم ڕاوچیم!

حەکیمەکە گوتی: کەواتە تۆ درۆت کردو ئەو پیاوە ڕاستی کرد!

پادشای جەنگاوەریش گوتی: لەبەرئەوەی درۆی کردووە لەگەڵتاندا، بیگرن بیخەنە بەندیخانە! ڕاوچییەکە زۆر پەشیمان بوو لەوەی درۆی کردبوو، لەگەڵ خەڵکی دوورگەکەداو ڕاستییەکەی لێ شاردبوونەوە..

کەواتە: لێرەوە ئەم پەندە کوردییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە دەڵێت: پەتی درۆ کورتە!






# گرنگی تەندرووستی خێزان

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا موحەممەد عەلی

**١- تەندرووستی خێزان، ئەرکێکی زۆر گرنگی سەرشانمانە:**

گرنگیدان بەتەندرووستی ئەندامانی خێزانەکەمان، ئەرکی سەرشانمانە، جێی خۆیەتی بایەخی تەواوی پێ بدرێت، لەبەرئەوەی خۆمانو خێزانەکەمان، ئەگەری هەیە تووشی گەلێك نەخۆشی ببین، کە ڕەنگە زیانێکی زۆرمان پێ بگەیەنێت. هەرکەسێك کەمتەرخەمی بکات لە مافی دایکو باوك، هاوسەرو منداڵەکانی، ئاگای لە تەندرووستییان نەبێتو نەیانپارێزێت لە نەخۆشیی؛ ئەوا لە ئاینی بەرزی ئیسلامدا تاوانبارە، ئەوەتا پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ ﴾ الاسراء: ٣١

واتە: (منداڵەکانتان مەکوژن). هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (هێندە بەسە بۆ تاوانباریی کەسێك، ئەو کەسانە فەرامۆش بکات، کە دابینکردنی ژیانیان لەسەر ئەوە) رواه أبو داود. زۆرن ئەو ئایەتو فەرموودانەی کە هانمان دەدەن بۆ گرنگیدان بە تەندرووستیی خێزان، لەهەموو قۆناغەکانی ژیاندا، هەر لە کاتی (هەڵبژاردنی هاوسەر، کاتی دووگیانبوون، منداڵبوون، سەرەتای هاتنە دنیای منداڵ...)، تاکو کۆتا چرکەی ژیانو بەخاکسپاردن.

**٢- ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر ئەندامانی خێزانەکەمان:**

**أ- گرتنەبەری هەموو هۆکارەکانی پاراستنیان لە نەخۆشی:**

دوورخستنەوەیان لە هۆکارەکانی نەخۆشی.

قەدەغەکردنی هەموو خووە زیانبەخشەکان لەماڵدا (جگەرەکێشان، خواردنەوە کهوولییەکان.. هتد).

خۆراکپێدانیان بە بڕی پێویستو تەندرووست، وشەی «بەدخۆراکی» زیادەڕۆییو کەمڕەوییش دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی زێدەڕۆیی کۆمەڵێك نەخۆشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، وەك: قەڵەویی.. هتد. بەهەمان شێوەش کەمی خۆراك، یان وازهێنان لە هەندێك جۆری خۆراك، دەبێت بەهۆی کەمبوونەوەی ئەو خۆراکانەی لەش پێویستییەتیو کۆمەڵێك ناتەواویو لاوازی لە لەشدا درووست دەکات. پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ الأنعام: ١٤٠ واتە: (دۆڕاوو خەسارەتمەندبوون ئەو کەسانەی منداڵەکانی خۆیان نەزانانە لەناوبرد).

**ب- بایەخدان بە هەموو ئەو شتە بەسوودانەی کە تەندرووستییان دەپارێزێت:**

هەموو ئەو بابەتانەی لەم زنجیرە بابەتەدا پێشتر باسکراون، وەك (تەندرووستیی دەروونی، نووستن، خواردن، وەرزشکردن،.. هتد).

**ج- ئەنجامدانی پشکنین بەشێوەیەکی ڕێکخراو:**

پێویستە هەموو شەش مانگ جارێك پشکنینی گشتی بۆ هەموو ئەندامانی خێزانەکەت بکەیت، بەمەبەستی دڵنیابوونەوە لە تەندرووستییان.

هەر نەخۆشییەك باو بێتو لە مێژووی خانەوادەکەو کەسە نزیکەکاندا هەبێت، پێویستە هەموو ئەندامانی خێزانەکە پشکنین بۆ ئەو نەخۆشییە بکەن، وەك (بەرزەگوشاری خوێن، شەکرە، شێرپەنجە، نەخۆشییەکانی خوێن،... هتد).

**د- چارەسەرکردنیان کاتێک نەخۆش دەکەون:**

لەڕێی سەردانکردنی پزیشکی پسپۆڕو گرتنەبەری ڕێنماییەکانی.

**٣- سۆزو میهرەبانیو خۆشەویستی خەڵکی:**

مامەڵەی پڕ لە سۆزو خۆشەویستیی نێوان ئەندامانی خێزانو دۆستانو ئازیزان، کاریگەرییان لەسەر دەروونیدرووستییو ساغی دەمارەکان نییە بە تەنها، بەڵکو ڕێگرییش دەکات لە تووشبوون بە ڤایرۆسو میکرۆبە جیاوازەکان، توێژینەوەیەك لە زانکۆی بنسلڤانیای ئەمریکی دەریخستووە، تووشبوون بەهەلامەتو نیشانەکانی کەمتر دەبینرێت لای ئەو کەسانەی خۆشەویستییەکی زۆریان هەیە بۆ دۆستانو نزیکانیانو خاوەن هەستو سۆزن. هەروەها سۆزو میهرەبانیو ئارامیو ئاسوودەیی زیاتر دەکەن، لەئەنجامدا بەرگریی لەش بەهێز دەکەن، توانای خۆڕاگریی کەسەکە، بەرامبەر بارودۆخە جیاوازەکان بەهێزتر دەکەن.

بەیارمەتی خودای گەورە، لە ژمارەکانی داهاتوودا بە درێژیی باسی تەندرووستیی خێزان دەکەین..





# بیبەری شیرین

بیبەری شیرین، یان بیبەری ڕۆمی، یەکێکە لە گرنگترین خواردنە بەهادارو بەسوودەکان لە ڕووی تەندرووستییەوە، بەهۆی بوونی چەندین ئاوێتەی خۆراکی پێویست بۆ تەندرووستی مرۆڤ، هەرچەندە بیبەری شیرین، وەك سەوزەمەنی بەکاردێت، بەڵام لە ڕاستیدا میوەیە، لەچەندین جۆری خواردندا بەکار دەهێنرێت وەك زەڵاتە، مەحشیو سەرەڕای بەکارهێنانی وەك سەوزەمەنی.

بیبەر بەچەندین ڕەنگی جیاوازی وەك سوورو زەردو سەوزو پرتەقاڵی، هەروەها ڕەنگی تری وەك ئەرخەوانیو مۆرو سپیو قاوەیی هەیە، سەرەتاو بەپێی زانستی شوێنەوار ٧٠٠٠ ساڵ پێش ئێستە لە مەکسیك هەبووە، پاشان بەهۆی باڵندەوە گوازراوەتەوە بۆ ئەمریکای ناوەڕاست، دواتریش ئەوروپاو هەموو جیهانی گرتووەتەوە (بەپێی گوتەی پێگەی (گیسوندهایت)ی ئەڵمانی، تایبەت بەپێشکەشکردنی ئامۆژگاریی پزیشکی). پێگەی (فیت فۆر فۆن)ی ئەڵمانی ئامۆژگاری ئەوە دەکات، بیبەر بە تازەیی بخورێت؛ بۆئەوەی سوود لە ڤیتامینە زۆرەکانی وەربگرن، بیبەریش بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، بەنوێی دەمێنێتەوە.

بیبەر بەهەمان شێوەی بەرهەمە ڕووەکییەکانی تر، سوودو بەهای خۆی هەیە، بەهۆی بوونی مادەی خۆراکیو ڤیتامینەکانی ئەیو بیو سیو توخمە کانزاییەکانی وەك گالیۆمو کالیسیۆمو تووتیاو مەگنیسیۆم تێیدا، سوودەکانی زۆرن وەك:

**یەکەم: چارەسەری کەم خوێنی**

کەمخوێنی، بەزۆری بەهۆی کەمی ئاسنەوە درووست دەبێت، ئاسن ئەو هیمۆگلۆبینە بەرهەم دەهێنێت، کە ئۆکسجین بۆ بەشەکانی لەش دەگوازێتەوە، بیبەر توخمی ئاسنو ڤیتامین سی پێوستی تێدایە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ چارەسەر، یا پاراستنی لە کەمخوێنی.

**دووەم: پاراستن لە شێرپەنجە**

بیبەری شیرین دژەهەوو دژەئۆکسێنی وەك کارۆتینو فلافۆنۆیدات لە پێکهاتنیدا هەیە، دژەئۆکسێنەرەکان ڕێ لەو هێرشانە دەگرن، کە دەبنە هۆی لەناوچوونو تێکچوونی خانەکان، دواتریش درووستبوونی خانەی شێرپەنجە.

**سێهەم: پارێزگاری لە چاو**

بەهۆی بوونی بڕێکی زۆر لە لۆتینو زاکسانسین لە بیبەری شیریندا، توانای پاراستنی چاوی هەیە لە نەخۆشیەکانی چاو، وەك: تاریکبوونی هاوێنەی چاوو تێکچوونی تۆڕی چاوو لاوازبوونی، ئەو دوو ئاوێتەیە، تۆڕەکانی چاو دەپارێزن، تۆڕی چاو بریتییە لە دیواری ناوەوەی چاوو هەستیارە بەو ڕووناکییەی کە بەهۆی زیانی ئۆکسێنەرەکانەوە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

**چوارەم: سووتاندنی چەوری زیادەی لەش**

بیبەری شیرین دەوڵەمەندە بە (کابسیسین)، ئاوێتەیەکی سەرەکییە لە بیبەردا، یارمەتی زیاد سووتاندنی چەوری لەش دەدات، بێئەوەی ببێتە هۆی ماندووبوونی دڵو بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن.

**پێنجەم. پاراستنی دڵ لە نەخۆشی**

بیبەری شیرین چەندین دژە ئۆکسێنەری تێدایە، بەپێی جیاوازی ڕەنگەکانی. دژەئۆکسێنەرەکانیش ڕۆڵیان کەمکردنەوەی ئۆکساندنی کۆلیسترۆڵە، ئەوەش دەبێتە هۆی پاراستنی خوێنبەرەکان لە ڕەق بوون، هەروەها بڕێکی باش، لە ڕیشاڵی تێدایە بەرهەمهێنانی کۆلیسترۆڵی خوێن کەم دەکاتەوە، بوونی ڤیتامین (بی٦)و فولات یارمەتیی نزمکردنەوەی تێکڕای ترشی ئەمینی (هوموسیستایین) کە هۆکاری تووشبوونی موولوولەکانی خوێنە بە هەوکردن، هەروەها یارمەتیی کەمکردنەوەی تێکڕای تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دڵو موولوولەکانی خوێن.

**شەشەم: بەرگریی لەش بەهێز دەکات**

بیبەری شیرین بڕێکی زۆری لەو ڤیتامینو توخمە کانزایانەی تێدایە، کە لەش لە نەخۆشییەکان دەپارێزێت، بیبەری شیرین بە یەکێك لەو خۆراکانەی زۆرترین بڕی ڤیتامین (سی) تێدایە یارمەتی کەمکردنەوەی هەوکردن دەدات لە لەشداو پارێزگاری لەو نەخۆشییانەش دەکات کە بەهۆی سەرماوە تووش دەبن.

هەروەها بەهۆی ئاوێتەکانی فلافونۆیدو کارۆتینو لۆتینو زیاکسانسینو کریبتۆزانتینی دژەئۆکسێن، لەش لە هەوکردن دەپارێزێتو ڕێگری تووشبوون بە نەخۆشی دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بیبەر دژە بەکتریایەو ئازارشکێنەو یارمەتیی ڕێکخستنی ڕێژەی شەکر دەدات لە خوێندا، سەرەڕای گرنگی ڕۆڵی لە نزمکردنەوەی ڕێژەی چەوریو کۆلیسترۆڵ.

**حەوتەم: نزمکردنەوەی فشاری خوێن**

لەبەرئەوەی بیبەر پۆتاسیۆمی تێدایە، یارمەتیی ئەو کەسانە دەدات کە بە نەخۆشی بەرزی گوشاری خوێن دەناڵێنن؛ چونکە پۆتاسیۆم گوشاری خوێن ڕێك دەخات.

**هەشتەم: ڕێکخستنی کرداری هەرس**

بەهۆی دەوڵەمەندی بیبەر بە ڕیشاڵەکان یارمەتیی ڕێکخستنی کرداری هەرسو ڕزگاربوونی لەش لە پاشەڕۆی خۆراك دەدات، کردنە دەرەوەی پاشەڕۆ بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ڕێگرە لە تووشبوون بە شێرپەنجەی کۆڵۆنو پارێزگاری لە تەندرووستی گەدەش دەکات.

**نۆیەم: گەشەی قژ زیاد دەکات**

بیبەری شیرین سووڕی خوێن باش دەکات، ئەوەش یارمەتیدەرە بۆ پاراستنی قژو ڕێگریکردن لە وەرینی، هەروەها سلیکۆنی تێدایە زۆر بەسوودە بۆ تەندرووستیی قژ.

**دەیەم: جوانکردنو تەندرووستیی پێست**

شەربەتی بیبەری شیرین، یارمەتیی کەمکردنەوەی چرچبوونی پێست دەدات؛ بەهۆی بوونی بڕێکی بەرز لە دژەئۆکسێنەرەکان تێیدا، هەروەها بڕێکی زۆر کۆلاجین لە پێستدا بەرهەم دەهێنێت، بەهۆی بوونی ڤیتامین سی تێیدا.

https://authoritynutrition.com
http://www.stylecraze.com
/http://blogs.naturalnews.com
http://www.dw.com
http://www.whfoods.com

# بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

## مۆمی ٤٦

و: ئاسیا سەلاح

خەڵکی بەسرووشتی، وەها درووستبوون، کە سەرسام بن بە خۆیانو کارەکانیانو هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بە ئەمانەوە.. هەروەها بەسرووشت وەها بەدی هێنراون، کە پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانیان بکەنو دەستکەوتو خێروبێرەکانیان زیاد بکەن، بەڵام بەگشتی، کاتێك خەڵکی لەگەڵ یەکدیدا مامەڵە دەکەنو حوکم بەسەر ڕووداوو هەڵوێستو شتی تردا دەدەن، ڕووبەڕووی کێشەی زۆرو جۆربەجۆر دەبنەوە.

له ڕاستیدا بەشێك لە هۆکاری کێشەکان دەگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی ئارەزووەکانیانو لاوازییان لە دانبەخۆداگرتنو ڕەتکردنەوەی ئەو ئارەزووانەدا.




ڕۆڵەکانم، ئێمە لە پەروەردگارمانەوە، داوامان لێکراوە کە لەگەڵ هەمواندا دادپەروەر بین، نزیك بێت، یان دوور، دۆست بێت، یان دوژمن، لەو پێناوەشدا لە لۆمەی لۆمەکاران سڵ نەکەینەوە، ڕاستی هەر ڕاستییەو چاکەش هەر چاکەیە، هەر کەسێك بیڵێت، یان ئەنجامی بدات، دۆست بێت، یان دوژمن، جیاوازی نییە، ناڕەوایی هەر ناڕەواییە، بەدکاری هەر بەدکارییە، خراپەش هەر خراپەیە، جا هەرکەسێك ئەنجامی بدات، دۆست بێت، یان دوژمن، هیچ جیاوازییەکی نییە..

ئەم دادپەروەرییەش بەدی نایەت، هەتا ئێمە یەك پێودانگو تایبەتمەندی بەکار نەهێنین بۆ هەموو.

ئێوە هەمووتان ئاشنای ئەو ئایەتانەی سوورەتی (المطففين ١-٦)ن، کە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾

«ئازارو ئەشکەنجەو لەناوچوون بۆ ئەوانەی کە لە کێشانەوە پێوانەدا دزی دەکەن، ئەوانەی کە بەپێوانە شتیان دەکڕی مافی خۆیان بەتەواوی وەردەگرت، بەڵام ئەگەر بە پێوانە شتیان پێ بفرۆشتنایە، کەمیان پێ دەدان، ئایا دڵنیا نین کە خوای گەورە بۆ ڕۆژی دوایی زیندوویان دەکاتەوە، ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی لە گۆڕەکانیان دێنە دەرو بەرامبەر خوای خۆیان ئامادە دەبن»

هەر لەو بارەیەوە دەگێڕنەوە کە شاعیرێك بەیەکێك لە سەردارەکاندا هەڵی داوە، ئیدی زۆری لەسەر گوتووەو لە ئاستی شایستەی خۆی زیاتر بەرزی کردۆتەوە، بەڵام پاش ماوەیەك ئەو شاعیرە زویرو تووڕە بووە لەو سەردارە، لەبەر ئەوە شیعرێکی دانا لەسەری کە زەمی دەکرد، هێندە زیادەڕۆیی کرد لە زەمکردنیدا، هەتا بە ناشرینترین خەسڵەت ناوزەدی کرد، خەڵکیش لەم بارەیەوە، پرسیاریان لێ کردو گوتیان:

چۆن ئەوەندە بەو پیاوەدا هەڵدەدیت، پاشان بەو ڕادەیەش زەمی دەکەیت؟

شاعیرەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: کاتێك لێی ڕازی بووم، هەرچییەکی باشم زانی بێت بۆم گوت، کاتێکیش لێی تووڕە بووم، هەرچییەکی خراپم زانی بێت، پێم گوت! لێرەدا ئەو خراپەی بەرامبەر کرد، کاتێك لێی ڕازی بوو، هەروەها کاتێك لێی تووڕەبوو، چاکەی بەرامبەر نەکرد؛ چونکە لە هەردوو بارەکەدا زیادە ڕۆیی کرد لە قسەکانی داو لە سنووری ڕاستەقینە لای دا. خوای گەورە وەها ئێمەی ڕێنمویی کردووە، کە دادپەروەر بین لەگەڵ یارو نەیاردا، وەك دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾

المائده ٨.

«ئـەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە، بــەردەوام بــن لە بەجێگەیاندنــی مافەکانــی خــودای گــەورەو گەواهی بدەن بەڕاستــیو دادپەروەری خودای گەورە، بــا ڕقو کینەتان لە قەومێك، واتــان لێ نەکات کە دادپــەروەر نەبن، دادپەروەر بن؛ چونکە ئەوە لە لەخواترسانەوە نزیکترە، لە خوا بترسن، بەڕاستی خودا زۆر بەئاگایە لە هەموو کردەوەکانتان».

ئەبــو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕێتەوە، کە ئەو ئایەتە لەســەر پیاوێك دابەزی، بە ئەبو جوهەینە ناسرابوو، دوو جۆر دەفری کێشــانەی هەبوو، یەکێکیان لە فرۆشــتندا بــەکاری دەهێنا، ئەوی تــر بۆ کڕین، یاخود لــە وەرگرتنی شــتدا، ئەمە نموونەیەکی زۆر قێزەونــە؛ چونکە ئەم پیاوە کێشــانەیەکیانی گەورە بوو، هەر کات شــتێکی بکڕیایە، ئەم گەورەیەیانــی بەکار دەهێناو کێشــانەی پێ دەکرد، هەروەها یەکێکــی بچووکیشــی هەبوو، کــە ئەگەر شــتێکی بەخەڵك بفرۆشتایە ئەوەیانی بەکاردەهێنا.

زۆر خەڵکیــش هــەن، هەمــان مامەڵە دەکەن، لە شــتە بڕۆنییەکاندا (معنوی)، بەبێئەوەی هیچ هەست بەشەرمەزاری بکەن، لەو بارەیەشــەوە پەیامبــەر دروودی خودای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەوەی پێی خۆشە لە دۆزەخ دووری بخەنەوەو بیخەنــە بەهەشــتەوە؛ بــا کاتێك مەرگ یەخــەی دەگرێت، بــاوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەبێــت، چی بۆ خۆی پێ خۆشە لە بۆی بێت، با لە ئەو جۆرەش بدات بەخەڵکی).

ئێمە پێمان خۆشە کە خەڵکی بەباشی لێمان تێبگەن، ئەگــەر هەڵەیەکیشــمان کرد، پۆزشــمان بــۆ بهێننەوە، هەروەها پێمان خۆشــە خراپەیەکمان لێ نەدۆزنەوە، کە تێمان دا نییە، لە بەهای بەهرەو ئەو چاکە خوازییەی کە تێماندایە کەم نەکەنەوە... بەڵێ، ئێمە هەموو ئەمانەمان پێ خۆشــە، جا ئەگــەر بمانەوێــت ڕەزامەندیی خودای گەورە بەدەســت بهێنینو لــە ئاگــری دۆزەخ ڕزگارمان بێت، بــا لەپاڵ باوەڕو کــردەوە چاکەکانــدا، ئەم جۆرە کارانــەش لەگەڵ خەڵکیدا بکەین، کە خۆی لە خۆیدا، لە مەرجەکانی دادپەروەریو بە جیبەێنانی دادپەروەرییە بۆ خودای گەورە....

### ئایا ئەمە چی دەگەیەنێت بۆ ئێوە ڕۆڵەکانم؟

ئەمە ئەم خاڵانەی خوارەوە دەگەیەنێت:

مامەڵەکردنی دادپەروەرانەی خەڵك، بە ڕێگایەکی ئاسانو لە خۆوە بەدی نایەت، بەڵکوو پێویســتی بە ترســی خودای گــەورەو خۆگرتنــەوەی دەروون هەیە، لە ڕاســتیدا زاڵبوون بەســەر ئارەزووەکانی دەروونداد، هەمیشــە بــەردی بناغەیە بۆ هەموو قۆناغەکانی ڕێگاکەو لە هەموو ئاســتەکاندا، پێم خۆشە ئەم ڕاستییە ڕوون بێت لە بەرچاوتان.

بۆ ئەوەی خۆمان بــەدوور بگرین لە لایەنگیری، دەبێت زۆر ورد بیــن لــە بەکارهێنانــی دەســتەواژەکانماندا، ئــەم سەردەمە سەردەمی وردییە، بۆیە گرنگە ئەو وشانەی کە بۆ وەسفکردن دەری دەبڕین، بزانین چۆن بەکاری دەهێنین، بۆ نموونە وەك: نایاب، ناوازە، سەرسوڕهێنەر، سەمەرە، زۆرباش، پەسەند، باش، خراپ نییە، خراپ، ڕووخێنەر، شەرمەزارکەر، نەخوازراو، کارەسات...

دەبێت هەر یەك لە ئێمە، بۆ بارێکی دیاریکراو ئەو وشانە بــەکار بهێنێت، نابێت بەپێی ســۆز، یان بەرژەوەندیی خۆی ئەو وشــانە جیا بکاتەوە لەکاتــی بەکارهێنانیدا، بۆ نموونە کاتێك وشــەی کارەســات بەکار دەهێنرێت، بۆ شــتێکی زۆر ترسناك بەکار دەهێنرێت، جا ئەو شتە کاری کەسی قسەکەر بێت، یان کاری یەکێك بێت لە دژو دوژمنەکانیو بەو جۆرە...

ڕۆڵەکانــم، هەمیشــە وریــا بــن لــە حوکمدان بەســەر خەڵکیدا لەســەر بنەمای گومانو خەیاڵ، یان خەملاندنێکی کەسێتی، یاخود بەپێی هەواڵێکی ئێرەو ئەوێ؛ چونکە ئەوە بەرپرســیارێتییەکی گەورەیە، خودای گەورە لە ئایەتی ١١٦ی سوورەتی ئەنعامدا دەفەرموێت:

﴿ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴾

«خۆ ئەگەر گوێڕایەڵیی زۆرینەی خەڵکی ببیت، لەســەر ڕێگای ڕاستی خودا لات دەدەن، ئەوان شوێنکەوتەی گومانو لە خۆیانەوە شت دەڵێن لەبارەی خوداوەو درۆدەکەن».

خۆتــان لە حوکمدان بەســەر نیازو مەبەســتی خەڵکی بــەدوور بگرن، ئەوە کارێکە بۆ خودای گەورە دانراوە، ئێمە تەنها حوکم بەســەر ڕواڵەتەکاندا دەدەین، خودای گەورەش خۆی لە نیازە پەنهانەکان دەپرســێتەوە. ئێمە لەسەر قسەو کردەوەو هەڵوێســتەکان حوکــم دەدەین، هەرچــی پاڵنەرو ئامانجو مەبەستەکانو هەرچییەکی شاراوەیە لە هۆکارەکانی؛ ئەوا ترس لە خودا، دەمانگرێتەوە لە باســکردنی؛ بۆئەوەی ستەمیان لێ نەکەین، شتێك بڵێین لەبارەیانەوە کە لە خۆیاندا نەبێت، هیچ کاتیش ئەو بنەما ئاڵتوونییە لەبیر مەکەن کە دەڵێت: «خۆت چۆنت پێ خۆشــە مامەڵەت لەگەڵدا بکرێت، ئاوهاش مامەڵە لەگەڵ خەڵك دا بکە»، یاخود بەو شــێوازە ڕەفتــار بکە لەگەڵ خەڵکیدا، کە لــە فەرمووده پیرۆزەکەدا هاتووەو پێش کەمێك لەمەوبەر باسمان کرد.

# ئایا حەز بە خۆدەرخستن دەکەیت؟

بۆئەوەی بزانیت کەسێکیت، حەز بە خۆدەرخستن دەکەیت، یاخود نا، بە وردیو درووستی، وەڵامی ئەم (١٥) پرسیارە بدەرەوە، پاشان بەپێی وەڵامەکەت، خاڵەکانت کۆ بکەرەوە..

١- ئایا بۆت پێش هاتووە، ئازار درابیت لە کاتی ئەنجامدانی وەرزشێکی ترسناکدا؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٢- ئایا حەز دەکەیت شانۆیەك بەڕێوەبەریت، بێئەوەی لەسەر تەختی شانۆ بیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٣- ئایا حەز دەکەیت ببیت بە کەشتیەوان؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٤- ئەگەر بە زیندانیکردن حوکمدرایت، ئایا حەز دەکەیت، لەو ماوەیەی کە لە زینداندایت، بخوێنیت؛ بۆئەوەی بڕوانامەی بەرزتر بەدەست بهێنیت. أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٥- ئایا لەوەوپێش سکاڵا، یان گلەییت کردووە، لە بەڕێوەبەری گەنجینە، یاخود یاریدەدەرەکەی؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٦- ئایا دەتەوێت بەشداری پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل بکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٧- ئایا دەتوانیت ببیتە بەرپرسی شوێنی نمایشکردنی کەرنەڤاڵێك؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٨- ئایا ژمارەیەکی زۆر هاوڕێت هەیە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٩- ئایا لە جێگەی کارەکەت، یان لەفەرمانگەکەت، کەسێکی خۆشەویستو لە دڵاشیرینی؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٠- ئایا حەز دەکەیت بە شەودا بەشداری خولو وانەکانی فێربوونو ڕاهێنان بکەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١١- ئایا حەز دەکەیت لە شارێکی گەورەدا، لە بواری بەڕێوەبردنی کارێکدا کاربکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا حەزدەکەیت ببیتە کەسێکی سیاسی ناودار، واتە: لە بواری سیاسەتدا کاربکەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٣- ئایا تۆ قسەکەرێکی باشی بۆ جەماوەر؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٤- ئایا حەزدەکەیت ببیتە پزیشك؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٥- ئایا تۆ کەسێکی لێوانلێویت لە زیندوێتیو چالاکیو گورجوگۆڵیو چالاکی؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

تێبینی: (بۆ سەرجەم خاڵەکان: لە هەڵبژاردنی وەڵامی (بەڵێ، دوو خاڵ)و (هەڵبژاردنی وەڵامی نازانم، یەك خاڵ)و (هەڵبژاردنی وەڵامی نەخێر سفر) دابنێ.

ئەنجام:

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (٢٦-٣٠) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی لە ڕادەبەدەر حەز بەخۆدەرخستن دەکەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (٢٢-٢٥) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی زۆر حەز بە خۆدەرخستن دەکەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (١٨-٢١) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی جۆرێك لە حەزکردن لەخۆدەرخستنت تێدایە.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (١٣-١٧) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی هاوسەنگی.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان(٩-١٢) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی تاڕادەیەك حەز بەخۆشاردنەوە دەکەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان(٥-٨) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی زۆر حەز بەخۆشاردنەوە دەکەیت.

* ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە نێوان (٠-٤) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ کەسێکی لەڕادەبەدەر حەز بە خۆشاردنەوە دەکەیت.

بەڕێزان: سەرجەم ئەم سیفەتانە مرۆڤ ئەگەر ویستو ئیرادەی هەبێت، دەتوانێت هەوڵ بدات بیانگۆڕێت، بە لایەنە ئەرێنییەکەیدا، واتە: ئەگەر بەڕێزێك نیگەران بوو، لەوەی کە ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکەی لایەنی نەرێنییە، ئەوە پێویست بە نیگەرانی ناکات؛ چونکە بە ویستو ئیرادەیەکی بەهێز، دەتوانیت بەرەو ئەرێنی، سیفەتەکەت بگۆڕیت.








# بینینی مانگ

هەڵوێستی هەیاسی خاس، لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیکدا:

ساڵێکیان لە کاتی هاتنی مانگی ڕەمەزاندا، وەکو نەریتی هەمیشەیی، خەڵکی لە ئێوارەی ٢٩ کوڵەمانگ "شەعبان"دا، بۆ دیتنی مانگی نوێ، سەیری ئاسمانیان دەکرد، ئەو کاتە ئەنەسی کوڕی مالیك لە ژیاندا بوو، تەمەنی لە ١٠٠ ساڵ نزیك بووبوویەوە، خەڵکی هەموان بەپەرۆشەوە بۆ مانگیان دەڕوانی، بەو هیوایەی ئەگەر مانگ بەدی بکەنو شایەتی بدەن لەبەردەم قازیدا؛ تا ڕای بگەیەنێت، کە سبەی یەکەم ڕۆژی مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە، هیچ کەس لە ئامادەبووان مانگی بەدی نەکرد، بەڵام ئەنەسی کوڕی مالیك چاوەکانی بڕییە ئاسمانو گوتی: (بەڕاستی من مانگم بینی، ئاماژەی بۆ جێگەی خۆرئاوابوون کردو گوتی: ئەوە مانگە، خەڵکەکە هەموو سەیری ئەو شوێنەیان دەکرد، بەڵام هیچ کەس مانگی بەدی نەکرد، کەسیش ڕووی نەدەهات، بڵێت: نایبینم لەبەر ڕێزیان بۆ ئەو هاوەڵە بەتەمەنە، لەو کاتەدا هەیاسی خاس سەیرێکی ئەنەسی کوڕی مالیکی کردو بینی برۆکانی درێژبووەو تاڵێك لە برۆی بە تەواوی هاتۆتە خوارەوەو شێوەی کەوانەیەکی درووست کردووە، زۆر بەڕێزەوە داوای مۆڵەتی لێ کردو دەستێکی بەسەر برۆکانیدا هێناو تاڵە درێژەکانی برۆی ڕێك کردەوە، پاشان پێی گوت: ئەی هاوەڵی پێشەوا: ئایا ئێستا مانگ دەبینی؟

ئەنەس سەیرێکی ئاسمانی کردەوەو گوتی: نەخێر ئێستا نایبینم، نازانم بۆ کوێ ڕۆیشت!!)

ئەم هاوەڵە بەڕێزە تەمەنی چووبووە سەر، هەیاس کەسێکی زۆر وردەکارو زیرەکو بیرتیژ بوو، کاتێك تاڵە برۆکەی بۆ ڕێك کردەوە، مانگی لێ ونبوو؛ چونکە هەر زوو هەستی کرد کە ئەو تاڵە برۆیەیە، شێوەی کەوانی درووست کردووەو ئەنەس وا دەزانێت مانگە!!

تێبینی: سەیرکردنی مانگ: زۆر کەس ئەم پرسیارەیان لا درووست دەبێت، بۆچی خەڵکی گەیشتە سەر مانگ، بەڵام موسوڵمانان نازانن کەی مانگ لە وڵاتەکەیان دەردەکەوێتو پێش چەند مانگێك بە خەڵکی ڕاناگەیەنن، کە فڵانە ڕۆژ ڕەمەزانە، یاخود فڵانە ڕۆژ جەژنە؟

ئەم پرسیارە لە زانایەکی فەلەکی موسوڵمان کرا.. لە وەڵامدا گوتی: بەڕێزان، ئێمە لە زانستی فەلەکیدا گەیشتوینەتە ئاستێك، کە دەتوانین ئێستا پێتان ڕابگەیەنین. کە نەك ئەم ساڵ، بەڵکوو حەفتا ساڵی دیکە ڕەمەزان، دەکەوێتە چ ڕۆژێکەوە، بەڵام ئەو بابەتە واتە: سەیرکردنی مانگ، بابەتێکی فیقهییەوە لە فەرمودەکەدا هاتووە کە دەبێت بە چاوی سەر سەیر بکرێت، بەبێ بەکارهێنانی هیچ ئامێرێك، لەبەرئەوەیە کە دەبێت موسوڵمانان لەشەوی ٢٩ شەعبان سەیری ئاسمان بکەن، ئەگەر مانگیان بەدی کرد، ئەو ڕۆژە بکرێتە ڕەمەزان، بەڵام ئەگەر مانگیان بەدیی نەکرد؛ ئەوا شەعبان دەبێتە ٣٠ ڕۆژو دواتر ڕەمەزان دەست پێ دەکات، ئەم شێوەیە بۆ زانینی ڕۆژی جەژنیش بە هەمان شێوەیە، واتە: لە ٢٩ ڕەمەزاندا، موسوڵمانان سەیری ئاسمان دەکەن، مانگ بەدی کرا، بۆ بەیانییەکەی دەکرێتە یەکەم ڕۆژی مانگی شەوال. واتە: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، خۆ ئەگەر مانگ بەدی نەکرا، ڕەمەزان دەبێتە ٣٠ ڕۆژو دوای ئەوە دەبێتە یەکی شەوال، واتە: یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان!

## ئەو شتانەی باوکم، لە ژیاندا پێی نەگوتووم!

و: چیمەن لەتیف

# باجی ڕابەرێتی

گەیشــتن بە ئاواتو بەدیهاتنــی خۆزگەکان، مافی ڕەوای گشت کەســێکە... بەمەرجێك باجەکەی بدات! هەموان حەز دەکەین ڕابەربین، بەڵام کێ باجەکەی دەدات؟

زۆر ئاســاییە کەســێك لەسەر کورســی دابنیشێتو قاچ بخاتە ســەرقاچ، دەنگ بەرز بکاتەوەو بڵێت: ئەگەر ڕەشمەی کارەکانم بدرێتە دەست؛ دەتوانم جیهان بگۆڕم، لە توانامدایە چاکسازی لە کۆمەڵگادا بکەم، ئەگەر دەستم بکرێتەوە، تەنها بەوەی هەلێکی بۆ بڕەخسێنن، بەرپرسو ڕایەکی هاکەزایی، بەلێهاتووییو کارامەیی، دەتوانێت گرێکوێرەی نێوان وڵاتانو کۆمەڵە جیاوازەکان بکاتەوە.

هەمووومــان دەتوانین ڕۆڵی ئــەو ڕەخنەگرە ببینین، کە کاری توێکاری لەســەر لاشەی داهێنان دەکات، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی ئەو کەسانە توانای ئەوەیان نییە، نیوە، یان کەمێکی ئەو کارە تەواو بکەن.

پێشەوا، ڕابەرو کەســایەتییە ڕاستەقینەکان، بەر لەوەی داوای پۆســتێك بکەن، دەبێت بــاوەڕی تەواویان هەبێت، کە هەر ئەرکێك بخرێتە ئەســتۆیان، دەتوانن جێبەجێی بکەن، ئامادەبــن بەر لە شــوێنکەوتووانو بێ هیــچ کەموکووڕیو دردۆنگییەك قوربانی بدەن.

دەگێڕنــەوە: هاوەڵانی پێغەمبەر، لە شــەڕی خەندەقدا برسێتی زۆری بۆهێنابوون، لە تاوا، یەکی بەردێکیان وەسەر زگیان خســتبوو، تونــد پێچابوویــان، هەندێکیان چوون بۆ لای ســەرکردەکەیان "پەیامبــەر دروودی خــودای لێ بێت" شــەکوای حاڵی خۆیان کرد، ئەویش بەزەردەخەنەوە وەڵامی دانەوە، لەسەرەخۆ بن، بنوارن ئەز دوو کوچکم وەسەر ناوکم ناوە، کاتێك بینیان، ئەو لە برســا دوو بەردی وەســەر زگی



خستووەو توند پێچاوێتی. هاوەڵان گەڕانەوە سەرکارەکانیان، دڵنیابوون لەوەی ڕابەرێکیان هەیە، بەر لە خۆی، غەمی ئەوانی لە کۆڵ ناوەو قورسایی ئەرکەکەی بە جوانترین شێوە داوە وەکۆڵیدا.

هاوڕێ، سەرکردە لە ڕێگای ڕەفتارەکانییەوە تەحەکوم بەو پەیامەوە دەکات، کە ڕەوانەی بەردەستەکانی دەکات، دەتوانێت ترس، یان ئازایەتی لە دڵی سەربازو شوێنکەوتووانیدا بڵاو بکاتەوە.

گەورەپیاوان، لە ڕێگای ئازایەتییەکی زۆرو گیانێکی بوێرو دەسپێشخەرییەکی ئەرێنییەوە بوون بە پێشەوا، سرووشتی ئەو ڕەفتارانە، هۆکاربوون کە هەمیشە لە پێشەوەی ڕووداوەکانو لوتکەی ژیاندا بن، ئەو هۆکارانە بەشێوەیەك کاری تێ کردوون کە کۆشش بکەنو بڕیار دەربکەن، ئەو بڕیارە قورسانەی کە کەسانی تر نەیاندەتوانی خۆی لە قەرەیان بدات.

لە ئەسکەندەری گەورە دەگێڕنەوە، کاتێك لە شام وەشوێن (دارا)، پاشای پارسەکان کەوتبوو ڕاوی دەنا، ماندوێتی برستی لە سەربازەکانی بڕیبوو، بەتایبەت پاش ئەوەی داوای لێکردن ڕاوەدوونانەکەیان بەردەوام بێتو لە ماوەی پازدە ڕۆژدا، ئەرکەکەیان تەواو بکەن، لەوکاتەدا ئاوی خواردنەوەی جەنگاوەرەکان لە کەمایەسیدا، خەریك بوو لە تینوا بپروکێن، زۆرێکیان بیریان بۆئەوە چوو پاشگەز ببنەوەو لەڕابەرەکەیان یاخی بنو بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون.

لە کاتێکدا ئەوان وابەستەی ئەسکەندەربوون، بە چرپە لە نێوانی خۆیاندا باسی دڵڕەقی سەرکردەکەیان دەدا بە گوێچکەی یەکدیدا، چۆن بەتینوێتیو برسێتی بەرەو لێواری مەرگیان دەبات، لەوکاتەدا کاروانێك بە تەکیاندا تێپەڕی، لەناو کاروانەکەدا، کەسانێك زانییان کە ئەسکەندەرو سوپاکەی تینوێتی شەکەتی کردوون، گەورەکەیان گۆزەیەك ئاوی هەڵگرتو بردی بۆ ئەسکەندەری گەورە، کاتێك گۆزەکەی بەرز کردەوە تەواشای کرد، چەندین قورگی وشکهەڵاتوو لێی دەنواڕن، گۆزە ئاوەکەی گەڕانەوە بۆ پیاوەکە بێئەوەی دڵۆپێك ئاو وەزاری کەوێتو گەرووی تەڕ بکات، گوتی: گەر ئەم ئاوە بخۆمەوە؛ ئەوا وەرەو مەعنەویاتی سوپاکەم دەڕووخێت.

کاتێك سەربازەکان بینیان، پێشەواکەیان بەم شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات، تەنانەت بێ ئەوان، ئامادە نییە گەرووی تەڕ بکات، دەستیان کرد بە هوتافکێشان، داوایان کرد بەرەوپێشەوە بڕۆن، ئاوەزەنگی ئەسپەکانیان ڕاکێشاو زینەکانیان توند کردو بە باوەڕو پەرۆشییەوە گوتیان؛ ئێمە تا پادشایەکی لەوجۆرەمان هەبێت، بەرگەی هیلاکیو تینوێتی دەگرین، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەین هەرچەندە تاڵو گران بێت.

هەر سەرکردەیەك، هەستی کرد لە غەمو پەژارەی شوێنکەوتووانی دابڕاو نییە، بەرلەوان خۆی تووشی چەرمەسەری دەکاتو تاڵاوی سەربازەکانی دەچێژێت، داوای کارێك ناکات ئەگەر بەرلەوان جێبەجێی نەکات. ئەو کارانە نموونەی ئەو باجانەن، کە پێشەوا دەبێت بیاندات، بەڵام زۆرێك لەوانەی بانگەشەی ڕابەرێتی دەکەن، ئاوڕی لێ نادەنەوە!

لەم ڕۆژگارەدا بەدەست جۆرەکەسانێکەوە گیرۆدە بووین، ڕابەرو پێشەوای خەڵکن، بۆخۆیان لە قولەی قاف دانیشتوون، شوێنکەوتووانیش لاوازو بێهێز، متمانەی شوێنکەوتووانو بەردەستەکانیان لەدەست داوە، کرداروگوفتارەکانیان جێی گومانی هەموانە.

ئەو سەرکردەی مەبەستمانە، سەرۆکی وڵات، یان ڕابەری حیزبێك نییە! کەسێکە پێشەوای کۆمەڵێکە لەوانەیە ڕابەری حیزبێك، یان پێشەوایەکی دیدەوانی بێت، یاخود باوکێك بێت لە ماڵ، بەڕێوەبەری مەسەڵەحەیەکی حکومی بێتو چەند کارمەندێك لە بەردەستیدا بن، تەنانەت ئەگەر خاوەنکارێك بێتو چەند کەسێکی کەم بەردەستیی بکەن.

پێشەوایەتی، ڕابەرایەتیکردنە، هاوواتای بەرپرسیارێتییە، قوربانیدانو بەخشندەییە، هەرکەس گەرەکێتی، ببێت بە ڕابەر با چاك بیر لە تواناکانی بکاتەوە، ئایا دەتوانێت باجەکەی بدات.

لە خۆت بپرسە بەرلەوەی لە ئاستێکی پیشەییدا پلەکەت بەرز بکرێتەوە ئایا بۆ ئەو کارە گونجاویت، یان نا؟

بەر لەوەی ماڵ درووست بکەیت، توزێك ڕاوەستە، بیر بکەرەوە: ئایا دەتوانیت گەورەی ماڵ بیت، لە تواناتدایە ئەرکی خێزانەکەتو خانەوادەکەت بە باشترین شێوە لەئەستۆ بگریت.

هەمیشە بیربکەرەوە، پێش ئەوەی بڵێیت: (من بۆ ئەو... گونجاو، ئەوەم ... دەوێت). ئایا بەڕاستی تۆ بۆ... لەباریت.

**پوختەی وتارەکە:** ئەگەر داوای سەرکردایەتیت کرد، خۆت بۆ سەرکردایەتیکردن سازکردبوو، پرسیار لە خۆت بکە، ئایا دەتوانیت باجی ئەو کارە بدەیت، ئەگەر توانیت؛ ئەوا پیرۆزت بێت، ئەگەر نا؛ لە سنووری تواناکانی خۆتدا بوەستە، لەو پۆشاکەدا بژی، کە پڕ بەبەرتە! هەمیشە لە یادا بێت: سەرکردە پێشەوایە، جێگای ئاسایی ئەو پێشەوەیە.

# وەڵامی بەجێ

* ئەو کاتەی گاندی، بەمەبەستی گفتوگۆ سبارەت بە قەیرانی ئاشتی لە وڵاتی هیندستان، سەردانی بەریتانیای کرد، بەرپرسێکی بەریتانی پێی گوت: بۆچی بەم جلوبەرگە کۆنەوە، کە بە تەواوی جەستەتی دانەپۆشیوە، هاتوویت بۆ شانشینی بەریتانیا!؟

گاندی لە وەڵامدا گوتی: لەبەرئەوەی من نوێنەرایەتیی نەتەوەیەکی برسیو ڕەشوڕووت دەکەم، ئیدی چۆن من خۆم بە جلوبەرگی گرانبەها برازێنمەوە، کە هاوڵاتییەکانم لەنێو شەقامەکان ڕووتووڕەجاڵن!

* ڕۆژێکیان لە باپیرم پرسی: براکەت خۆشتر دەوێت، یان هاوڕێکەت؟

باپیریشم گوتی: براکەمم خۆش دەوێت، کاتێك دەبێت بە هاوڕێم، هاوڕێکەشم خۆش دەوێت، کاتێك دەبێت بە برام!

* ئەنیشتاین ڕۆژێك بە چارلی چاپلینی گوت: ئەوەی بووەتە هۆی ناوبانگی تۆو هەموو دونیا دەتناسن ئەوەیە کە هەموان لە زمانت تێدەگەن!

چارلی وەڵامی دایەوەو گوتی: بە پێچەوانەشەوە ئەوەی بووەتە هۆی ناوبانگو گەورەیی تۆ، ئەوەیە کە هیچ کەسێك لە قسەکانت تێناگات!

* قەلەڕەشێك لە تووتییەکی پرسی: بۆچی خراویتە نێو قەفەسەوە؟

تووتییەکەش گوتی: چونکە قسە دەکەم!

سەرنجی جیاوازیی ئەم دوو وتەیە بدە:
یەکەمیان دەڵێت: من سێ جار شکستم هێنا!
دووەمیان دەڵێت: من کەسێکی شکستخواردووم!

ئێس – هایا کاوا ئەندامی پیرانی ئەمریکا

بەشێوەیەکی گشتی، مرۆڤی هەژار، وەرزی هاوین لە هەمان شوێن بەسەر دەبات، کە زستانی تێدا بەسەر بردووە.

فران لیبۆڤیتێر- قسەخۆش

بەختەوەرترین کەس، ئەو کەسانەن، کە هۆکارێکی دیاریکراویان نییە بۆ بەختەوەری، جگە لەوەی کە لەناخی خۆیاندا بەختەوەرن.

دەبلیو – ئار – ئینج- نووسەر

من دەوڵەمەندم؛ چونکە داهاتم زێترە لە مەسرووفاتم، مەسرووفاتیشم یەکسانە بەو شتانەی کە ئارەزووی دەکەم.

ئیدوارد جیبۆن - مێژوونووس

هەندێك وا دەزانن، تەنها بە چاندنی درەختێك، میوەت چنگ دەکەوێت، بێئەوەی چاوەڕێی نەشونمای درەختەکە بکەن!

تنکۆ ڤۆترا سیاسەتمەدار



# گۆرانی بلێ بۆ ژیان

نارین جووتیار



# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## ١٠ ستیفن هاوکینگس

## Stephen Hawkings

ستیفن لە دیارترین زاناو لێکۆڵەرانی بواری فیزیایە، بەتوانا عەقڵییەکەی، هەموو جیهانی سەرسام کردووە، سەرەڕای ئەوەی نە دەتوانێت قسە بکات، نەدەشتوانێت بجووڵێت. چەندین بیردۆزی لەبارەی زانستی گەردوونەوە هەیە.

**ژیانی:** لە شاری ئۆکسفۆرد لە ٨ی نیسان ١٩٤٢ لەدایك بووە، ئەو خاوەن عەقڵە بلیمەتە، لە منداڵیدا یەکێك نەبووە لەو قوتابییانەی کە چاوەڕێی دوارۆژێکی گەشیان لێ بکرێت، کە تەمەنی ٩ ساڵان بووە، نمرەکانی زۆر خراپ بووەو سەرکەوتوو نەبووە لە هەوڵدان لە وانەکانی قوتابخانەی، تەنها حەزی بەوە بووە، کە کاژێر یا ئامێرەکان لەیەك جیاکاتەوەو بیانخاتەوە سەریەكو شتی نوێتریان لێ درووست بکات، تا ئەو ڕادەیەی لە قوتابخانە ناوی ئەنیشتاینی بەسەردا براوە، هەرچەندە ئاستێکی باشی نەبووە، بەڵام هەستیان بە بلیمەتی ئەو کردووە. سەبارەت بە وەرگیرانی، لە سەرەتادا باوکی نەیتوانیوە بینێرێت بۆ زانکۆ؛ چونکە باری ئابووری باش نەبووە، دوای ئەوەی تاقیکردنەوەی تواناکانی پێ دەکرێت، نمرەی وەرگرتنی لە زانکۆ بەدەست دەهێنێت. زۆر حەزی لە بیرکاریو فیزیا بووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە بەشی فیزیا لە زانستی تەنۆلکەکانو زانستی گەردوونی خوێندوویەتی.

**تووشبوونی بە نەخۆشی:** تەمەنی تەنها ٢١ ساڵ بوو، کە تووشی نەخۆشیی دەماری بوو، کە ناسراوە بە (ڕەقهەڵاتنی لاتەنیشتی) بە تێپەڕبوونی کات، خستییە سەر کورسیو لە جووڵەی خست، دکتۆرەکان هۆشدارییان دا، کە نەخۆشییەکەی زۆر ترسناکەو ناتوانێت دوو ساڵ زیاتر بژی، بەڵام ستیفن توانی بەرەنگاری نەخۆشییەکەی بێتەوەو گەشبینانە مامەڵە بکات، بەمەش دکتۆرەکانی تووشی سەرسوڕمان کرد، هەرلەوکاتەوە گەشتی بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشیو داهێنان دەستی پێ کرد..

ناخۆشییەکانی بەم نەخۆشییە کۆتایی نەهات، بەڵکو لە ١٩٨٥ تووشی ئاوسانی پەردەی سی بوو، هەروەها نەشتەرگەرییەکی بۆ گەرووی کرا، دوای ئەوە بەیەکجاری لە قسەکردن کەوت، ئەندازیارێکی ئەمریکی بەناوی «واڵت وۆلتز» گەشەی بە سیستەمێکی ژمێریاری دا، کە لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت وشە داواکراوەکان بخاتە سەر شاشەی کۆمپیوتەر، پاشان شارەزایەکی تر پەرەی زیاتری بەم سیستەمە دا، لە کامبریج کە بتوانرێت بە کورسییە جووڵاوەکە بلکینرێت.

**لێکۆڵینەوەو خەڵاتەکانی:** کتێبێکی هەیە بەناوی «پوختەی مێژووی کات» ئەو کتێبە تێگەیشتن لە بابەتە ئاڵۆزەکانی فیزیا ئاسان دەکات، کە لە ئەرستۆ تا ستیفنو وینبێرگ، ئەم کتێبە چوەتە ناو کتێبی گینس بۆ شکانی پێوانەی جیهانییەوە، کە فراوانترین ئاماژەیە، بۆ زیاتر لە ٤٠ زمان وەرگێڕدراوەو کراوەتە فلیمیش لە ساڵی ١٩٩١ لە لایەن دەرهێنەر ستیفن سبیلبێرگ..هەروەها لەگەڵ کوڕەکەی لویس بەشداری لە نووسینی کتێبێك بۆ منداڵان کردووە لەبارەی گەردوونەوە لەشێوەی درامایەکی سەرسوڕهێنەر، لە ساڵی ٢٠٠٧ کە یەکێکە لە چیرۆکە خەیاڵییە زانستییەکان، چەندین یاسای فیزیایی شی دەکاتەوە بۆ منداڵان بە شێوازێکی ئاسانو سەرنجڕاکێش

Georges Secret Key To The Universe

دووەمیشیان لە ٢٠١١ بەناونیشانی

George and the Big Bang

گەورەترین دەستکەوتی ژیانی، سەلماندنی تیۆری گەردوونی بێکۆتا بوو (بیردۆزی ئەنیشتاین لەبارەی گەردوونەوە) لە ساڵی ١٩٨٣، خاوەنی چەندین خەڵاتی ڕێزلێنانە.. بە درێژایی ژیانی کارکردنی لە بواری فیزیادا، چەندین خەڵاتی پێبەخشراوە، گرنگترینیان لە ساڵی ١٩٧٤ لە کە ئەکادیمیایەکی زانستی بەریتانییە، مەدالیای ئاڵتوونی پێ بەخشراوە Royal society بۆ زانستو خەڵاتی ئەنیشتاینیشی پێ بەخشراوە، لە ١٩٨٠ نازناوی "کوماندەر"ی پێبەخشراوە، کە بە واتای سوارچاك دێت لە ئینگلترا، هەروەها لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، مەدالیای سەرۆکایەتی بۆ سەربەستی پێ درا.

ستیفن دوو جار هاوسەرگیری کردووەو سێ منداڵی هەیە، سەرەڕای لەکارکەوتنی تەواوی دەمارەکانی لە ژیانێکی چالاکدا دەژی، لەڕێگەی کۆمپیوتەرەوە پەیوەندی بەزانایانەوە دەکاتو بەردەوامە لەسەر زانستو زانیاریو لێکۆڵینەوە.

ئێمە لە (ستیفن)ەوە فێری ئیرادەو ئومێد دەبین، ئەگەر تا ئێستا هەستت بە نائومێدی کردبێت لە ژیان؛ ئەوا دوای خوێندنەوەت بۆ ئەم زانا بلیمەتە، بۆت دەردەکەوێت کە هیچ شتێك ئەستەم نییە، ئەو هەمیشە دەڵێت: «سەیری ئەستێرەکان بکەن، نەوەك بەردەمی خۆتان»، واتە: مرۆڤەکان دەتوانن بە عەقڵو بلیمەتیی خۆیان، ڕێرەوی ژیانیان بگۆڕن، تۆ لەهەر بارودۆخێکدا بیت؛ دڵنیام بارودۆخت لەم زانایە خراپتر نییە. بۆیە ئارەزووی هەرشتێك بکەیت، دەتوانی بەدەستی بهێنیت، بەمەرجێك هەوڵو کۆششی بۆ بدەیت.

لە کۆی ئەو ١٠ کەسایەتییانەی باسمان کردوون، بۆمان دەردەکەوێت، کە زیرەکی مانای ئەوە نییە، مرۆڤ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا سەرکەوتوو بلیمەت بێت، بەڵکو ئەوەیە بتوانیت، لە بوارێك لە بوارەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنیتو بگەیتە لوتکە.

# قەڵەمێکو داهاتووی دوو منداڵ...



و:کارزان مەحموود

منداڵی یەکەم بەهۆیەوە، دەبێتە دزێکی گەورەی ترسناك! منداڵی دووەم: بەهۆیەوە دەبێتە لێپرسراوی گەورەترین کۆمەڵەی خێرخوازی لە وڵاتدا..!! ئەوکەسەی خۆی ئەم ڕاستیانەی لەزاری ئەو تاوانبارە بیست، دوای ئەوەی ڕۆژێك بۆ کارێك دەچێتە نووسینگەی پارێزەران، لەنێو نووسینگە ئەم تاوانبارە دەبینێت، کە کێشەکەی لەلای یەکێك لەپارێزەرەکانی هاوڕێی بوو، کە پێیان دەگوت چەتە گەورەو ترسناکەکە، هەربۆیە دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵیداو پرسیاری لێ دەکات، تۆ چۆن گەیشتیت بەم ڕۆژەو تائەوەی ببیتە پیاوێکی ئاوا؟ بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: دایکم هۆکاربووا! گوتم: چۆن؟ زەردەخەنەیەکی تری کرد بۆمو گوتی: بەڕێزم لەپۆلی چوارەمی سەرەتایی بووم، دوای ئەوەی ڕۆژێك لەقوتابخانە گەڕامەوە، قەڵەمەکەمم ون کردبوو، دوای ئەوەی دایکم دەزانێت قەڵەمەکەمم ون کردووە، تووڕە دەبێتو دەکەوێتە لێدانو قسەی ناشیرین پێگوتنم. لەبەر ئەو هەڵوێستە دڕندانەی دایکم بڕیارم دا، چیدی بەدەستی بەتاڵ نەگەڕێمەوە بۆ لای دایکم.. لەو ڕۆژە بەدواوە، کەوتمە دزینی قەڵەمی هاوڕێیانی پۆلەکەم، سەرەتا لەدزینی قەڵەمی هاوڕێیەکم، دواتر هاوڕێیەکی ترم، دواتریش قەڵەمی هەموو قوتابیانی پۆلەکەم، دەڵێت: لەسەرەتادا دەترسام، بەڵام هێواش هێواش ترسم نەما، بەڵکوو توانیم ڕێگاو شێوازی جۆراوجۆر بەکار بهێنم لە دزیکردنەکەمداو تاوای لێهات، کەوتمە دزیکرن لەسەرجەم پۆلەکانی قوتابخانەو دواتریش لە ژووری بەڕێوەبەری قوتابخانەش، تا ئەوەی ئێستا بوومەتە ئەم کەسە، تەنهاو تەنها بەهۆی قەڵەمێکەوە...!! بەڵام منداڵی دووەم: دایکی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێك منداڵەکەم لەپۆلی دووەمی سەرەتایی بوو، ڕۆژێك دوای ئەوەی لە قوتابخانە دەگەڕێتەوە، دەڵێت... دایە لە قوتابخانە قەڵەمەکەمم ون کردووە، دایکی دەڵێت: منیش پرسیم چیت کرد..؟ گوتی: لەهاوڕێکەم قەڵەمێکم وەرگرت.. دەڵێت: وتم زۆرباشت کرد کوڕم، بەڵام لە پاداشتی ئەو کارە باشەی هاوڕێکەت، تۆ هیچت پێ دا؟ کوڕە گوتی: نەخێر، دایەگیان.. دایکی گوتی: بەڵام ئەو توانی کارێکی زۆر جوانو چاك ئەنجام بدات.... ڕۆڵەکەم، تۆ هەوڵ بدە کاری لەو باشترو چاکترو جوانتر ئەنجام بدەیت؟ گوتی: چۆن دایە؟ دایکی گوتی: دوو قەڵەمت بۆ دەکڕم، قەڵەمێکیان بۆ نووسینو کۆششی خۆت، قەڵەمەکەی تر... ناوی بنێ (قەڵەمی چاکە) کاتێك کە هاوڕێکانت قەڵەمیان لێ ون دەبێت، یان بیر دەچێت؛ ئەوا قەڵەمی چاکەیان پێ بدە، کە بێگومان دواتر دەتدەنەوە، دوای تەواوبوونی وانەکە.. کوڕەکە بە بیرۆکەکەی دایکی زۆر خۆشحاڵ دەبێت.. کاتێك بیرۆکەکە جێبەجێ دەکات، زۆر هەست بە بەختەوەری دەکات، تا وای لێهات یەك قەڵەمی دانابوو، بۆ نووسینی خۆی، شەش قەڵەم لەنێو جانتاکەیدا هەبوو، کە لێی نووسیبوون (قەڵەمی چاکە) دایکە دەڵێت: ئەوەی زۆرسەرنجڕاکێش بوو ئەوەبوو، کە کوڕەکەم پێش ئەوە زۆر ئارەزووی خوێندنی نەبوو، ئاستی زانستیشی زۆر لاواز بوو، بەڵام بەئەنجامدانی ئەم کارە قوتابخانەی لا خۆشەویست بوو، تاوای لێهات بوو بە پێشەنگی قوتابییەکانی قوتابخانەکەی، خۆشەویست لەلای گشت قوتابیانو مامۆستایان. هەرکاتێك مامۆستا بیزانیایە قوتابییەك نانووسێت، بەهۆی ئەوەی قەڵەمی پێ نییە، مامۆستا دەیگوت: کوا فلانە قوتابی خاوەن قەڵەمی یەدەگ.. لەکۆتاییدا: دایکە گوتی؟ ئێستا کوڕەکەم دەرچووی زانکۆیە، خێزاندارە، ئێستا لێپرسراوی گەورەترین ڕێکخراوی خێرخوازییە لە شارەکەدا..!! لەبەرئەوە پێویستە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانماندا، لێزانو وریابین، خۆشەویستیو کاری جوان لە نێویاندا بچێنین، تا بتوانین تاکی باشو سوودبەخش بە خەڵكو کۆمەڵگا پێشکەش بکەین، نەك نەوەکانمان ببنە مایەی ئازارو ترسو بەدبەختی بۆ کۆمەڵگا..

سەرچاوە: بالحب نربي أبناءنا: د. عبدالله محمد



# ئاگری نەزانین!

هودا عەبدوڵلا

کوڕە گەنجەکە، هەرچەندە لە لادێ دەژیا، بەڵام زۆر ڕۆشنبیر بوو، زیاتر لە پێنج سەد کتێبی خوێندبوویەوە، هەموو جارێ کە دەچوو بۆ شار بۆ فرۆشتنی ئەو ماستانەی دایکی درووستی دەکرد، بە بەشێك لە پارەکە، هەندێك کتێبی دەکڕی، دراوسێکەیان کوڕێکی هاوتەمەنی ئەویان هەبوو، ئەو کوڕەی دراوسێیان لەبەر نەزانی تووشی کێشەی زۆر دەبوو، گەنجە ژیرەکەش بڕیاری دا یارمەتیی بدا بەو زانستەی کە هەیبوو.

ڕۆژێك پڕ بە باوەشی کتێبی هەڵگرتو بۆ کوڕی دراوسێکەیانی بردو گوتی: ئەم کتێبانەم هێناوە؛ تا سوودیان لێ وەربگریت، دڵنیابە ئەم کتێبانە وات لێ دەکا، بەرز بیتەوەو وەك ئەستێرە لە ئاسمان بدرەوشێیتەوە، هەرکەسێ بەکاری هێناوە، هەر سوودی لێ وەرگرتوە، کوڕی دراوسێیان کەمێك سەری خوراندو گوتی: باشە، لەوانەیە سوودیان لێ وەربگرم، گەنجە ڕۆشنبیرەکە زۆر دڵخۆش بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: بێگومان ئەم کتێبانە دەیگۆڕێت، هەروەکوو چۆن زۆر کەسی دیکەی گۆڕیوە...

چەند ڕۆژێك تێپەڕی، زستان بوو، داریش کەم بوو، بۆ ئاگرکردنەوە، ڕۆژێکیان باران دەباری، گەنجە ڕۆشنبیرەکە ویستی بزانێت، ئاخۆ چ گۆڕانێك بەسەر کوڕی دراوسێیاندا هاتووە، بەپەرۆشەوە چاکەتەکەی پۆشیو چووە دەرەوە، لە کاتێکدا بارانێکی بەلێزمە دای کردبوو.. چوو بۆ ماڵی دراوسێکەیان، لە دەرگای دا، کاتێك کوڕەکەی دراوسێیان ئەوی بینی، گەشایەوەو بەڕووخۆشیەوە پێشوازی لێکرد .....فەرموو ...فەرموو، بارانە لە دەرەوە مەوەستن، تکایە، بە ڕوویەکی گەشەوە ڕووی لە گەنجە ڕۆشنبیرەکە کردو گوتی ..بەڕاستی نازانم، چۆن سوپاستان بکەم، زۆر سوودم لە کتێبەکانت وەرگرت.. بەدرێژایی یەك حەفتە، من لە شوێنی دار، ئاگری پێ دەکەمەوە، ئایە کتێبی زیاترت هەیە پێم بدەیت؟!



جەلال عەبدوڵڵا حاجی

بەشی سێیەم

# نەوتو
# (ژینگە، کۆمەڵگەو مافی مرۆڤ)

دەرهێنانی نەوت، کاریگەریی گەورەی لەسەر زەوی هەیە، بەجۆرێك کاریگەرییەکەی لەسنووری دۆزینەوەی چاڵە نەوتییەکان تێپەڕ دەکات، بەتایبەتی ناوچە دوورە دەستەکان، لە وڵاتە تازە گەشەکردووەکاندا، کاری دەرهێنان بەردەوام لەزیادبووندایە، بەهۆی دۆزینەوەی بەردەوامی یەدەگی نەوتەوە، ناوچەیەکی فراوان وێران دەکرێت، بەمەبەستی دروستکردنی یەکەی بەرهەمهێنانو کەمپ بۆ مانەوەی کارمەندەکانیان.

هەڵکەندنی بیر لە دەریادا، زۆری تێدەچێتو مەترسیی زۆرە، بەهۆی سەختی کەشوهەواوە، ئەگەری ڕووداو زیاتر دەکات، لەکاتی گواستنەوەی کەشتییەکاندا، لەلایەن ڕۆژنامەنووسانەوە ناتوانرێت بەئاسانی چاودێری کێڵگە نەوتییەکانی دەریا بکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی خۆدزینەوەو لادانی وەبەرهێنەرەکان لەیاسا. لە وڵاتە تازەگەشەکردووەکاندا، داهات سنووردارە، وەزارەتی ژینگەش کەمتوانایە، توانای گواستنەوەی چاودێرانو سەرپەرشتیارانی نییە بۆ سەکۆ نەوتییەکان، لە هەندێك حاڵەتدا، کۆمپانیاکان خۆیان نەوت دەگوازنەوە، بۆ خۆیشیان وادەی پشکنینەکان دیاری دەکەن.

پیسبوونی ژینگە بە کانزای (جیوە Hg)، بە یەکێك لە کاریگەرییەکانی هەڵکەندنی بیری نەوت دادەنرێت، کاتێك جیوەکە دەچێتە ئاوەوە، تێکەڵ بە خواردنی ماسیو گیانەوەرە ئاوییەکان دەبێت، خواردنی ماسیی پیسبوو بە جیوە، هۆکارێکی ڕاستەوخۆیە بۆ گواستنەوەی جیوە بۆ مرۆڤ، جیوە کانزایەکی قورسو ژەهرە، کاریگەریی هەیە لەسەر کۆئەندامی دەمارو کۆرپەلەو ڕژێنەکان.

ڕەنگە کاریگەریی نەوتی خاو لەسەر ژیانی گیانەوەران زۆر بێت، ببێت بەهۆی لەناوچوونی ماسیو گیانەوەرە ئاوییەکانی تر، یان زیانیان پێ بگەیەنێت، نەوتی خاو لە ئاو سووکترە، کاتێك دەڕژێتە ئاوەوە، لەگەڵیدا تێکەڵ نابێت، چینێکی تەنك لەسەر ڕووی ئاوەکە دروست دەکات، ئۆکسجینی هەوا لە ئاوەکە دادەبڕێت، ڕێگە بە تێپەڕبوونی تیشکی خۆر نادات، لە ئەنجامدا دەبێت بەهۆی مردنو لەناوچوونی ڕووەكو گیانەوەرە ئاوییەکان.. تا بڕی ئاوەکەش کەم بێت؛ کاریگەرییەکەی وێرانکەر دەبێت، هەر گیانەوەرێکی شیردەریش لەو نەوتە هەڵبمژێت، یان بچێتە ناو خواردنەکەیەوە، دەبێت بەهۆی ئازار لە گورچیلەو جگەریدا، بەهەمان شێوە دەبێت بەهۆی دابەزینی بەرگریی لەشی گیانەوەرەکە، لە هەندێك حاڵەتدا، ڕەفتارەکانی دەگۆڕێن، ئەم کاریگەرییانە گیانەوەرەکە لاوازو ماندوو دەکات، دەبێتە نێچیرێکی ئاسان بۆ گیانەوەرانی تر.

ژینگەی پیسبوو بە نەوت، زیان بەو باڵندانە دەگەیەنێت، کە لەو ناوچەیە هێلانە دەکەن، یان بەناویدا کۆچ دەکەن، بە پیسکردنی پەڕەکانیو نەمانی توانای دابڕینی گەرمی، ئەمەش وا دەکات توانای فڕینو مەلەکردنی نەمێنێت، ئەگەر باڵندە، بڕێکی کەم نەوت بخوات؛ ڕەنگە بمرێت، ڕژانو لێچوونی نەوت، بووە بەهۆی مردنی دەیان هەزار باڵندە، ژمارەی باڵندەی مردوو، پەیوەندیی هەیە بەکاتو شوێنی ڕووداوەکەوە (ڕێگەی کۆچی باڵندەکانو وەرزەکەی).

لە کاتی دەرهێنانی نەوتدا، گازی سرووشتی دێتە سەرەوە، ڕێژەکەی بەگوێرەی بیرەکە دەگۆڕێت، ئەم گازەش هۆکاری پیسبوونی ژینگەیە، بەتایبەتی ئەو ناوچەیەی لێی دەردەهێنرێت، ئەگەر گازەکە جیا نەکرێتەوەو چارەسەرنەکرێت؛ ئەوا لەشوێنی بیرلێدانەکەدا دەسووتێنرێتو دەکرێتە هەواوە، کە بەرهەمهێنەری گازی یەکۆکسیدی کاربۆنو ئۆکسیدی نایترۆجینە (هۆکاری سەرەکیی تەمەدووکەڵی ترشن)، لەگەڵ گازی ئۆکسیدی گۆگرد (هۆکاری سەرەکیی ترشەبارانە)، لە وڵاتی نەیجیریا بەهۆی زۆری ڕێژەی ئەم گازانەوە، دانیشتووانەکەی بەدەست کێشەی تەندرووستییەوە دەناڵێنن.

لەحاڵەتی نەسووتاندنی گازەکەدا، بەبێ چارەسەرکردن دەکرێتە هەواوە، ڕێژەیەکی زۆر گازی (میسان)ی تێدایە، ئەم گازە کاریگەری زۆری لەسەر گۆڕانی کەشوهەوا هەیە، هەروەها گازی سرووشتی ڕێژەیەکی زۆر، گازی گۆگردیدی هایدرۆجینی تێیدایە ($H_2S$)، ئەم گازە ژەهرو کوشندەیە، دەبێت بەهۆی داخورانی بۆریی نەوتو پاڵاوگەکان (هەرگازێکی سرووشتی ئەم گازەی تێدابێت، بە گازێکی ترش دادەنرێت) دەبێت لەم مادەیە خاوێن بکرێتەوە. (لەکاتی تێپەڕبوونی تەنکەرەکانی نەوتدا، ڕۆژانە بۆنی ئەم گازە دەکەین، بۆنێکی ناخۆشی هەیە، لە بۆنی هێلکەی خراپبوو دەچێت!)).

سەرچاوە: کتێبی(الرقابة على النفط –دليل الصحفي فی مجال الطاقة والتنمية- التخلص من لعنة الموارد)- ريفينيو ووتش-معهد المجتمع المنفتح.



# ئەبوئەعلای مەودودی

## ١٣٢١ - ١٣٩٩/ ١٩٠٣-١٩٧٩

بەرزان ئەبوبەکر

**بە مانای وشە، زانابوو..**

ئەبوئەعلای مەودودی، زانای بەناوبانگو بیرمەندی لێهاتوو، بانگخوازی گەورەی ئیسلام، یەکێکە لە عەلامەو زانا ناودارەکانی سەدەی نوێ، ڕابەری کۆمەڵی ئیسلامی بووە لە هیندو پاکستان.. ژیاننامەکەی لە سازگارترین ژیاننامەکانی زانایانە، تێکەڵەیەکە لە باوەڕو زانستو ئارامگریو هیواو ورەبەرزی، بەڕاستی زەرەرمەندن ئەوانەی ژیانی ڕاستەقینەی ئەم زانا پایەدارە ناخوێننەوە!

**سەرەتای ژیانی مەودودی:**

مەودودی لە ڕۆژ هەینی ١٩٠٣/٩/٢٥ لە شاری ئۆرانك ئاباد لە ویلایەتی (حەیدەر ئاباد) لە هیندستان لەدایك بووە، باوکی پارێزەرێکی زیرەكو لێهاتوو بووە، بەڵام وازی لە پیشەکەی خۆی هێناوە، گەڕاوەتەوە بۆ پەیمانگاکەی خۆی، بۆئەوەی بەرگری لە ستەملێکراوو خاوەن مافەکان بکات.

باوکی کاری کردووە لە پەروەردەو فێرکردنیدا، مەودودی هەر بە منداڵی فێری زمانی عەرەبیو فارسی بووەو قورئانی پیرۆزو فەرموودەو فیقهـ فێربووە، هەروەها موەتتەئی پێشەوا مالیکی لەبەر کردووە.



مەودودی لە تەمەنی چواردە ساڵیدا، بڕوانامەی دواناوەندی بەدەست هێناوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زیرەکیو لێهاتوویی، هەروەها ئەو کاتە، وەکو ڕۆژنانەموونووسێك وتاری نووسیوەو وتاری داوە.. بەڵام ئەم بارودۆخە زۆر بەردەوام نەبوو، وەك نەریتی هەمیشەیی زانایان، ڕێگە ڤیرتاوڕێژو تەختو بێگرێ نەبووە، مەودودیش وەکوو زانایانی دیکە، بە کۆمەڵێك ناڕەحەتیو دەردەسەریدا تێپەڕیوە، لەوانە خێزانەکەی دووچاری هەژاریو دەسکورتی بوونو ژیانیان قورسو سەخت بووە، مەودودی هەموو ڕۆژێك بیست میل ڕێگەی بڕیوە، بۆ ڕۆیشتنی بەرەو قوتابخانە، هەروەها بیست میل بۆ گەڕانەوەی بەرەو ماڵ، لە شارۆچکەیەکی دراوسێیان، بەڵام ئەم بارودۆخەش زۆر بەردەوام نابێت؛ چونکە لەو ساڵەدا باوکی ماڵئاوایی لە ژیان دەکاتو خێزانێکی هەژارو دەستکورت جێ دەهێڵێت، مەودودی لەو بارودۆخەدا ناچار دەبێت، کە واز لە خوێندن بهێنێتو ڕوو بکاتە کارکردن بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی.

لەو دەمەدا، واتە: لە تەمەنی چواردەساڵیدا، چەند وتارێکی بەهێزو ئاگرین دەنووسێت، بۆ ڕۆژنامەکان بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام، مەودودی بەهرەیەکی ناوازەی لە نووسیندا هەبوو، بەهرەکەی خامۆش نەکرد، بەڵکوو پەرەی پێ داو بەردەوام بوو لە نووسین، تا لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا، بوو بە سەرنووسەری گۆڤاری (المسلم)، کە کۆمەڵەی زانایان دەریان دەکرد.

لە کاتێکدا گاندی بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبووەتەوە، مەودودی بۆ ڕەتدانەوەی ئەو قسەیەی گاندی، کتێبێکی نووسی بەناوی (الجهاد فی الإسلام)، ئەو کتێبە ئەو کات دەنگۆیەکی گەورەو سەدایەکی باشی لەناو موسوڵماناندا دایەوە، ئەوەش بوو بە خاڵی وەرچەرخانی مەودودی.

**بیرمەندو دانەر:**

مەودودی خۆی تەسلیمی ئەو واقیعە نەکرد، وازی لە قوتابخانە هێنا، بەڵام بەردەوام بوو لە خۆپڕچەککردن بە زانستو زانیاری، سەرەتا دەستی کرد بە زانستەکانی زمانی عەرەبیو زانستی شەرعیو فەرموودەو فیقهو ئەدەبی عەرەبیو ڕەوانبێژیو مەنتیق، پاشان دەستی کرد بە فێربوونی زمانی ئینگلیزی، توانی لە ماوەی چوار مانگدا فێری زمانی ئینگلیزی بێت، پاشان دەستی کرد بە خوێندنی ئەدەبی ئینگلیزیو مێژوو فەلسەفەو زانستی کۆمەڵایەتی ڕۆژئاوایی، پاشان بەراورد لە نێوان کەلتووری ئیسلامیو کەلتووری ڕۆژئاوایی، بینی جیاوازییەکی زۆر گەورە هەیە، لە نێوان ئەو دوو کەلتوورەدا.

هاوکات بە تەنها سەرپەرشتی ئیدارەی گۆڤاری (ترجمان القرآن)ی دەکرد، ساڵی ١٩٣٣، وێڕای ئەوەی هەورازو نشێوی زۆر لەسەر ڕێ، بەڵام کاتو هەوڵی زۆری بۆ ئەو گۆڤارە تەرخان کردووە، لەو بارەیەوە مامۆستا خەلیل حامیدی دەڵێت: بە تەنها خۆی سەروتاری دەنووسیو چەندین وتاریشی تێدا دەنووسی، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لە ڕێی پۆستەو گەیاندنەوە دەهاتن، ئەوانەی بە نامە دەهاتن، پاشان پۆستەکانی ڕێك دەخستو پوولی لە نامەکان دەداو ناونیشانی کەسەکەی لەسەر دەنووسیو دەیناردەوە بۆ بەشداربووان.

بە نەریتی خۆی، ڕۆژانە زۆر سەرقاڵی خوێندنەوەو

فێربوونی زانست بووە، جاری وا هەبووە، نوێژی عیشای کردووەو دانیشتووە دەستی بە خوێندنەوەو نووسین کردووە؛ تا نوێژی بەیانی بێداربووەو بەردەوام یان کتێبی خوێندووەتەوە، یان نووسیویەتی، پاش نوێژی بەیانی چەند کاتژمێریك خەوتووەو پاشان بە گورجوگۆڵیو چالاکی بەرەو نووسینگەی کارکردنی بەڕێ کەوتووە، هاوکات مەودودی لە ڕووی داراییەوە، زۆر هەژار بووە، تەنانەت شەوی وەها هەبووە، هیچ شتێکی دەست نەکەوتووە بیخوات، بەبرسێتیو بێشێو سەری ناوەتەوە.. زۆر ڕۆژیش جگە لە نیسكو ئاو، هیچ شتێکی دیکەی شك نەبردووە.

هەموو خەمێکی لەو گۆڤارەدا، بریتی بوو لە پڕکردنەوەی گۆڤارەکەی لە بیری درووستو زانستو ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی زانستی ئیسلامی، تایبەت بە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پەیامبەر (درودو سڵاوی خودای لێ بێت)، هەروەها زانستی فیقهی بەوشێوەی تێی گەیشتبوو.

وتارەکانی مەودودی خاوەنی تازەگەریو ڕەسەنایەتیو ناوەرۆکێکی پڕواتاو قووڵ بوو، ئامانجیان دەپێکا، تا ئەو ئاستەی زۆرێك لە بیریارو خەمخۆرانی ئیسلام، وتارەکانیان وەردەگێڕایە سەر زمانە جیهانییەکان، لەوانە ئینگلیزیو فارسیو فەرەنسی، هەروەها زۆرێك لە نووسراوو کتێبەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی، مەودودی بەردەوام بوو لە سەرنووسەری ئەم گۆڤارە بەپێزو پڕ زانستە، تا ئەو کاتەی گەڕایەوە بەر ڕەحمەتی پەروەردگار لە ساڵی ١٩٧٩.

مەودودی لە وتارەکانیدا ڕەخنەی لە هەموو شێوەو شێوازەکای سەردەمی نەفامی کۆنو نوێ دەگرت، هاوکات ڕەخنەی لەو بانگخوازانە دەگرت، کە چەقیان بەستووەو ئەوانەش کە بەکوێرانە شوێن مەزهەبەکان کەوتوون، هەروەها ڕەخنەی لەوانە دەگرت، بەڕەهایی بە ڕای خۆیان ئیجتهادیان دەکرد، هەروەها ڕەخنەی لە کەسانێك دەگرت، کە نکۆڵییان لە زانستی فەرموودە کردووەو ئەوانەش کە زۆر ئاسانکار بوون لەو بوارەدا، ئەوانەش کە ئاینیان کردووە بە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزووەکانیان.

### ڕابەرایەتیی مەودودی:

مەودودی لە ساڵی ١٩٤١، لەگەڵ کۆمەڵێك بانگخوازو بیرمەندو کەسایەتیی ناودار، کۆمەڵی ئیسلامیان دامەزراندو ئامانجەکانی ئەو کۆمەڵەیان ڕاگەیاند:

چەسپاندنی دینی خودا. پەیڕەوکردنی ئاینی ئیسلام، هەوڵدان بۆ ڕەزامەندی خودا، تێکۆشان بۆ سەربەرزیی دوارۆژ، (مەبەستی سەرەکی تەنها ڕەزامەندیی خودایە).

ئەم کۆمەڵەیە سەرەتا بە حەفتاو پێنج کەس دەستیان پێ کرد، کە تەنها خاوەنی حەفتا ڕوپیە بوون، مەودودی وەکو یەکەم سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە هەڵبژێردرا.

چالاکییەکانیان لە نیمچەکیشوەری هیند دەستی پێ کرد، کاتێك پاکستان لە هیندستان جیابوویەوە، کۆمەڵەکەش دابەش بوون لە نێوان پاکستانو هیندستاندا، کاتێکیش لە سێپتەمبەری ساڵی ١٩٦٥، جەنگ لە نێوان پاکستانو هیندستان دەستی پێ کرد، مەودودیو کۆمەڵەکەی، ڕۆڵێکی بەرچاوو دیاریان هەبوو لە بەرزکردنەوەی وورەی جەماوەرو هاوکاریکردنو یارمەتیدانی ئاوارەکانی جەنگ، هەروەها بەشێوەیەکی ئەرێنی، بەشدارییان لە پێشکەشکردنی هاوکاری پزیشکیدا کردو نزیکەی ٢٠ مەڵبەندی تەندرووستیان دامەزراند بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی تەندرووستی لە کشمیر، مەودودی چەندین وتاری لەوبارەیەوە پێشکەش کرد.

### دەستگیرکردنی مەودودیو سەپاندنی حوکمی لە سێدارەدان:

داواکارییەکانی مەودودی لە چوار خاڵی سەرەکی پێك هاتبوون: حاکمیەت تەنها بۆ خودا، شەریعەتی ئیسلامی یاسای بنەڕەتیی وڵات بێت، هەڵوەشاندنەوەی ئەو یاسایانەی کە دژو پێچەوانەی ئیسلامن، حکوومەت لە هەڵسوکەوتو مامەڵەیدا بە شەرعی خوداوە پەیوەست بێت.

ئەم داواکارییانەش بوو بەهۆی بەریەککەوتن لەگەڵ حکوومەتداو بەو هۆیەوە چەند جارێك مەودودی دەستگیر کرا، بەڵام مەودودی بەردەوام بوو لە ئەنجامدانی چالاکیی فیکری، تا دواجار دەستگیرکراو پاش چوار ڕۆژ لە دەستگیرکردنی لە ٢٤ شەعبانی ساڵی ١٣٧٢ فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، ئەوەش بووە هۆی هەڵایسانی شۆڕشێك لە تووڕەییو ڕق لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا، دەرچوونی چەندین برووسکە لە هەموو جێگەیەکەوە بۆ خەمخۆرییان سەبارەت بەو حوکمە، تا ئەو کاتەی حکوومەت ناچار بوو حوکمەکەی سووك بکات بۆ زیندانی هەتاهەتایی، بەڵام کاردانەوە یەك لە دوا یەکەکان سەبارەت بەو حوکمە، بۆ پێشەوا مەودودی، بوو بەهۆی ئەوەی حکوومەت بەناچاری بڕیاری لێبوردنی بۆ مەودودی دەرکرد لە ساڵی ١٩٥٥.

دوای ئازادبوونی مەودودی بەردەوام بوو لە کاری بانگخوازیو فیکری، مەودودی لە دیارترین ئەو بانگخوازانە بوو، کە بانگەشەی بۆ سەربەستیو یەکڕیزی دەکرد، هەمیشە گەلی ئاگادارو هۆشیار دەکردەوە، کە پشتیوانی پەرتەوازەیی نەکەن، تا نەبێت بەهۆی دابەشبوونی نیشتمانەکەیانو بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ؛ چونکە ئەو دووانە لە ڕووداوە ترسناکەکانن، کە هەمووان تێیدا زەرەرمەند دەبن.

### ڕێزگرتن لە مەودودیو گوژانەوەی ڕووناکییەکەی:

مەودودی دوچاری نەخۆشی هات، بەو هۆیەوە داوای کرد کە دەستلەکارکێشانەوەی پەسەند بکەن لە ڕابەرایەتی کۆمەڵی ئیسلامی، لە ساڵی ١٩٧٢، ئیدی لەو کاتەوە ڕووی کردە نووسینو توێژینەوە، سەبارەت بە تەواوکردنی تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، هەروەها دەستی کرد بە نووسینی ژیاننامەی پێغەمبەری ئازیز(درودو سڵاوی خودای لێ بێت).

لە ساڵی ١٩٧٩ مەودودی خەڵاتی مەلیك فەیسەڵی بەدەست هێنا، کە تایبەت بوو بەو کەسانەی خزمەتی ئیسلام دەکەن، مەودودی یەکەم کەس بوو کە ئەو خەڵاتی ڕێزلێنانەی بەدەست هێنا، بەهۆی ئەو هەموو تێکۆشانو ماندووبوونەی لە بواری ئیسلامو موسوڵمانان.

لە ٢٢ سێپتەمبەری ساڵی ١٩٧٩ ترووسکایی ئەم مۆمە ناوازەیە کوژایەوە، کە لە پێناوی بەرگریکردن لە ئیسلامو موسوڵمانانو شوناسی ئیسلامی داگیرسابوو، ڕۆحی پیرۆزی بەرەو مەلەکووتی ئاسمانەکان بەرزبوویەوەو ماڵاوایی لە ژیانی دونیا کرد، مەودودی جێگەیەکی گەورەی بەجێ هێشت کە پڕکردنەوەی ئاستەمە، بەڵام دانراوو نووسینەکانی، بیرو هزرو ژیاننامەیەکی هێندە بەنرخی تۆمار کرد، کە بوو بە پێشەنگو پێشەوایەکی چاك بۆ زانایانو بانگخوازانو تێکڕای موسوڵمانان، بە درێژایی مێژوو.

دانراوو کتێبەکانو نامیلکەکانی مەودودی زیاتر لە سەدو پەنجا دانراوە.

# تۆ چ جۆرە باوکێکیت؟

## سیفەتە باشەکانی دایكو باوك:
## (١٠ بناغە بۆ گۆڕینی ئاکارەکان)

وەسفکردنی منداڵی نارێکوپێكو ئەوەی کە شتەکانی فڕێ دەدات بەملاو بـەولادا، ئەم ئاکارە لای ئەم منداڵە ناگۆڕێتو فێری یاسا نابێت، بەڵام باشترین شێواز، ئەوەیە کە زۆر بەئارامی هەستێکی بێزاریو نارەزاییبوونی پێ بگەیەنیت، ئیتر لەگەڵ ڕۆژگاردا، وردەوردە دەگۆڕێتو هەوڵی چاککردنی دەدات.

وا باشترەو بەرژەوەندیی منداڵەکەش لەوەدایە، کە جەخت بکرێتەوە لەسەر چۆنێتیی ڕاستکردنەوەو گۆڕینی ئاکارە نابەجێو قەبووڵنەکراوەکان، نەك جەختکردنەوە لەسەر سەرزەنشتو ڕەخنەگرتن لە کەسێتیی منداڵەکە.

ئەمەش چەند بناغەیەکی سەرەکی پێشنیارکراون:

١- بە تەواوی ئەو ئاکارە دیاری بکە، کە دەتەوێت بیگۆڕیت.

٢- لەگەڵ منداڵدا، زۆر بەدیاریکراوی قسە لەسەر ئەوشتە بکە، کە لێی چاوەڕێ دەکەیت، چیت لێی دەوێت.

٣- بۆی ڕوون بکەرەوە، چۆن دەتوانن ئەمە بەدەست بهێنن.

٤- لەسەر ئاکارە جوانەکانی سوپاسی بکەو بەشانوباڵیدا هەڵبڵێ.

٥- بەردەوام بە لە دەستخۆشیکردن لەسەر ئاکارە جوانەکانی، هەتا لەلای ببێتە خوو، هەرکات ڕێگەیەکی چاکی گرتەبەر، لە ڕازیبوونی خۆت بەرامبەری، دڵنیای بکەرەوە؛ بۆئەوەی وەك پێوانەیەك، کاری چاك بناسێت.

٦- خۆت بپارێزە لە بەکارهێنانی هێزو توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵ، هونەری یاریکردن بەکار بهێنە، لە بری ئەوەی منداڵ بەزۆر بنێریت بۆ سەر جێگەکەی، بیکە بە پێشبڕکێ (کاممان زوتر دەتوانین بچینە سەر جێگەکەی خۆمانو ئامادەی خەوتن دەبین) دەتوانیت ژماردنیش بەکار بهێنیت.

٧- هەمیشە ئامادە بە لای منداڵەکانت، تەنها بڕیارو ئاراستەکردن بەس نییە، دەبێت زۆر جەخت لەسەر ئەوە بکەیتەوە، کە تاچەند گرنگی بە لەگەڵبوونیان دەدەیت، گەر منداڵان ببینن باوکانیان گرنگییان پێ نادەن، پاڵنەری چاککردنو گۆڕینی ئاکارەکان لەدەست دەدەنو ناتوانن وابەستەی ئاکارە جوانەکان بن.

٨- هەڵەی ڕابوردوو بیر مەهێنەرەوە، دووبارەکردنەوەی هەڵە ڕابوردووەکان، منداڵ تووشی بێزاریو دارمان دەکات، وای لێدەکات ئەو هەڵەیە دووبارە بکاتەوە.

٩- نموونەی جوانی بۆ بهێنەرەوەو بیگوازەرەوە بۆ پاشەڕۆژ.

١٠- لە کاتێکدا حاڵی دەروونیت ئاسایی نییە، ماندوویت، تووڕەیت، شپرزەیت، هەرگیز بڕیارو فەرمانو قەدەغەکردن بەسەر منداڵەکەتدا مەخوێنەرەوە.



ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد
و: خالید موحەممەد

# بۆ دڵی دایکم!

ئارام نەبی مەحموود

**سڵاو دایەی ئەزیزم..**

دایەگیان، زۆر لەمێژە، بە نیازم کوڵی دڵم هەڵبڕێژم، دەمێکە تامەزرۆی نووسینم بۆ تۆ، گەلەك لەمێژە، دەمەوێت بتدوێنم، گەرەکمە بەدەم هەنسکی گریانەوە، دڵی پڕم خاڵی بکەمەوە، خۆ دەمێکە دەگریم، عەجەب هیچ کەس فرمێسکەکانم نابینێت، دەمێکە دەمەوێت بۆ کەسێك بدوێم، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا، سەختە دۆزینەوەی کەسێك، کە گوێت لێ بگرێتو لێت تێبگات!

دایەگیان.. بیرت دەکەم؛ پتر لە هەرکات، بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم، کە لە باوەشتدا دەنووستم، بیری ئەو شەوانەی کە قاچەکانمت دەخستە کۆشتەوە؛ تا سەرمای زستان نەیانتەزێنێت، بیری ئەو شەوانەی کە تا دەخەوتم، پەنجە نەرمەکانت لەناو پرچم دەهێناو دەبرد، بیری ئەو پێکەنینە بێدەنگانەی، کە هەزارەها واژەی لەخۆ گرتبوو، بیری ئەو ماچە سادانەت، کە هیچ ڕیاییەکی تێدا نەبوو، بیری ئەو خۆشەویستییەت دەکەم، کە بێبەرامبەر بە منتدا، بیری ئەو دینارانەی کە لە تۆوە وەرم دەگرتو خەرجم دەکرد، بیری ئامۆژگارییە ئاڵتوونیەکانت دەکەم، حەزدەکەم منداڵ ببمەوە؛ نا لەبەر چێژی منداڵی، خۆ منداڵیمان چێژێکی نەبوو! بەڵکو لەبەر چێژی لەگەڵ تۆبوون!

خۆزگە، بەر لە ونبوونت، تامی بێتۆییم بکردبایە.. خۆزگە، بەر لە ڕۆیشتنت، دەرکم بەو جەهەننەمە بکردبایە، کە دوور لە تۆ، بۆمن ئامادەیە.. خۆزگە، لەگەڵ خۆتدا دەتبردم.. خۆزگە، دەبووم بە هاودەمو هاوسێت!

ئێی هێی.. ئاخر لای من هێشتا زۆر زووبوو، هەرگیز بیرم لەوە نەکردبۆوە؛ ئەوا زوو ماڵاواییم لێ بکەیت، منی گێژ، هەرگیز ئەوە بە کەللەمدا نەهاتبوو، کە ڕۆژێك بەبێ تۆ ژیان بگوزەرێنم!

بەبێ دایك، مانایەك بۆ خێزان نامێنێتەوە، ماڵ بەبێ دایك، ماڵ نییە، وێرانەیە.. بڕوا ناکەم درووستکراوێك هەبێت، لە دایك جوانترو ناسکترو میهرەبانتر، بەڕۆشتنت، بێلانەو بێماڵت کردم، بێکەست کردم، بێحاڵت کردم، منت کرد بە هاوڕێی تەنهایی، تۆ سوکنایی دڵو ئارامی ڕۆحم بوویت، باوەشت نیشتیمانی پڕ لە میهرو سۆزی من بوو، ئێستا دوور لە تۆ ئاوارەو سەرگەردانم!

تا ئەو کاتەی لە ژیاندابوویت، نەمتوانی بە ئەندازەی پێویست لە خزمەتتدا بەو خزمەتت بکەم، سەیرم لە خۆم دێت، ئەسڵەن سەیرم لە مرۆڤ دێت، ئێمە بۆ واین؟! چ بوونەوەرێکی ڤێزەونین؛ بێز لە خۆم دەکەمەوە، تا کەسە نزیكو خۆشەویستەکانمان لە دەست نەدەین، نرخیان نازانین، کە لامان دەڕۆن، ئینجا بیری ئەوەمان دەکەوێتەوە، وەکو پێویست ئاگامان لێیان نەبووەو دڵیانمان ڕانەگرتووە، ڤەت دیوتە بۆ زیندووەکان فرمێسك هەڵبوەرێنین، ڤەت دیوتە پێش لەدەستدانی ئازیزانمان عاشقیان بینو حەز بە ژیان بکەین لەگەڵیان، ئێمە لە وشەکانی میهرو عیشقو خۆشەویستیو وەفا تێناگەین، نا!

ئێمە باوەشە نەرمو گەرمەکان، بە باوەشی ساردوسڕە بێگیانەکان دەگۆڕینەوە! ئێمە دەتلێینەوەو خۆمان دەدەین بە زەویدا؛ تا ماچی مردووییەك بکەین؛ تا باوەش بە جەستەیەکی ساردەوەبوودا بکەین؛ تا بۆ دواجار تەماشای سیمای زەردهەڵگەڕاوی بکەین؛ تا ماڵاوایی یەکجارەکی لێ بکەین!

سەیرە تەمەنێك بە زیندوویەتی لەگەڵیاندا ژیاین، ڕۆژێك بیری ماچێکمان نەبوو! ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لەوە ناکەینەوە، بکەوینە ماچکردنی دەستو ڤاچی دایکمان، ڕۆژێك ئەوە بە خەیاڵی پووچماندا نایەت؛ تا خۆڵی ژێر پێیان بۆن بکەین.. تا ون نەبن لەبەر چاوان، لە چاوانیان ورد نابینەوە، چەندە سەختە! نووسینیش لەو بارەوە سەختە، حاڵم نەبووە؛ تا توانیومە ئەم چەند وشەو ڕستەیە پێکەوە بنێم!

بێ دایکی یانی: وەختێك دەکەویت، کەسێك نییە هەڵتبگرێتەوە.. کاتێك دەگریت، کەسێك نییە لە باوەشت بگرێتو فرمێسکەکانت بسڕێت.. کاتێك خەفەتباریت، کەسێك نەبێت لە کەنارتەوە.. یانی ئەوپەڕی بێکەسیو سەرگەردانی!

دەزانم، دەزانم ئێستاش لە گۆڕدا دڵت هەر لامە، هەر خەمی منتە، خەمی نانی بەیانیانو چای نیوەڕۆیان، خەمی سەرمای شەوان، خەمی پاکی جلوبەرگەکانم، خەمی بەسەلامەتی گەیشتنەوە بۆ ماڵ، خەمی خۆداپۆشینم بۆ دەرەوە، خەمی ئەوەی ئیتر جگە لە تۆ، هیچ کەس نییە بانگم بکات بە: «ئارامۆکە»!

دایەگیان، گەردنم ئازاد بکە، بمبەخشە، ئەگەر ڕۆژێك دڵم ئازار دابێت، ئەگەر ڕۆژێك بێگوێیم کردبێت، ئەگەر ڕۆژێك دەنگم بەسەرتدا بەرز کردبێتەوە، ئەگەر ڕۆژێك درەنگ گەڕابێتمەوە بۆ ماڵ، ئەگەر ڕۆژێك بێئەدەبییەکم لە حزوورتدا کردبێت، ئەگەر ڕۆژێك لاساریم کردبێت، دڵنیابە من بێ تۆ هیچم!



ئا: سەلاح عیسا _ خوێندکاری ماستەر لە تورکیا

بەشی پێنجەمو کۆتایی

# لەگەشەسەندنی ئابووریدا

## کاریگەریەکانی پەروەردە لەسەر پێشخستنی ئابووری

٢. کاریگەریی پەروەردە لەسەر داهات: کاردانەوەیەکی گەورە دەبینین لە نێوان گرنگیدان بە زانینو فێرکاریو لە بەرامبەردا بەدەستهێنانی داهاتی یەکسانی زیاتر، یاخود تۆمارکردنی بەرزترین ڕێژەی گەشەسەندنی ئابووری. بۆیە زانینو خوێندەواریی بەرز، هۆکاری سەرەکین بۆ ئەوانەی کە داهاتیان نزمە؛ تا بتوانن بە دوای کاری نوێدا بگەڕێنو داهاتەکانیانی پێ بەرز بکەنەوە. بۆ نموونە: توێژینەوەیەکی پەیوەندیی نێوان فێرکردنو نایەکسانی لە داهاتو هەژاریدا، لە نێوان ١٨ وڵاتی ئەمریکای لاتین، لە ناوەڕاستی ساڵەکانی هەشتاکاندا ئەوەی دەرخستووە، کە داهاتی کرێکارە خوێندەوارەکان، چواریەك زیاتر بووە لەوانەی کە ئاستیان لە خوێندنو زانستدا، وەکوو ئەوان نییە، کەواتە: ئەمەش ئەوە دەردەخات، فێرکردن هۆکارێکی بەهێزە بۆ یەکسانی داهاتی تاکەکان.

هەروەها لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە، کە بە زیادبوونی لە ١٠٪ی هێزی کار، ئەوانەی کە بەلایەنی کەم، تا قۆناغی ئامادەییان خوێندووە، بەشەداهاتی ٤٠٪-٦٠٪ ی خەڵکەکەی خوارەوە بەڕێژەی ٦٪ -١٥٪ زیاد دەکات. ئەم زیادەی داهاتە، لە ٣٦ وڵاتدا وای کردووە، کە ڕێژەی پەیوەندیکردنی تاکەکان بۆ قوتابخانە دواناوەندییەکان زیاتربێت.

فێرکردن لەوانەیە کاریگەری هەبێت لە داهاتی تاکەکەس، لە ڕێگەی کاریگەری لەسەر ژمارە ڕێژەییەکان، واتە: گەشەی دانیشتووان، بۆ نموونە: لێکۆڵینەوەیەکی نێوان چواردە وڵاتی ئەفریقایی، دەری خستووە، کە پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان فێرکردنو خوێندنی کچانو ڕێژەی لەدایکبوون لە نێوان هەموو ئەو وڵاتانەدا، واتە: تا کچان نەخوێندەوار بن؛ ڕێژەی منداڵبوون زیادی کردووە، بەپێچەوانەشەوە ڕاستە، ئەو کچانەی کە تا قۆناغی سەرەتاییان خوێندووەو دواتر وازیان هێناوە، کاریگەری خوێندنەکە کەمتر لەسەریان هەبوو، کە نەهێڵن منداڵیان ببێت، بەڵام ئەوانەشی تا قۆناغی ناوەندی بەردەوام بوون، کاریگەری خوێندنەکەیان زیاتر لەسەر بووە. ئەمەش ئەوە دەردەخات، کەتا ئەو کچانە زیاتر ئاستی زانینو فێرکردنیان هەبووبێت؛ ئەوا ڕێژەی منداڵبوون تێیاندا کەمتر بووەتەوە، مەبەست لە باسکردنی ڕێژەی منداڵبوون، لێرەدا ئەوەیە کە تا ئەو ڕێژەیە زیاد بکات، داهاتی تاك کەم دەبێتەوە لە خێزانێکدا، کەواتە: تا فێرکردن زیاتر بێت، منداڵبوون کەم دەبێتەوە، تا منداڵبوونیش کەم بێتەوە، داهاتی تاك زیاد دەکات. بۆ نموونە: ئەو سێ وڵاتەی وەکو کینیا، بوتسوانیا، زیمبابۆی، کە توانیان ڕێژەی لەدایکبوون کەم بکەنەوەو ڕێژەی مردنی منداڵانیان کەم بێتەوە، هۆکارەکەی ئەوەبوو، کە بەرزترین ئاستی فێرکردنی کچانیان هەبوو.

بەهەمان شێوە فێرکردن، دەتوانێت داهاتی تاك زیاد بکات، ئەگەر هاتو دەزگا پەروەردەییەکان، تاك بۆ بازاڕ دروست بکەن، مانای ئەوەش ئەوەیە، دەبێت تاکەکان ئەوەی لە قۆناغەکانی خوێندن فێری دەبن، دواتر ببێتە هۆی دەسکەوتی ژیانو کارکردن بۆیان، نەك تەنها بڕوانامەیەك بەدەست بهێننو تەواو، ئەمەش کاتێك دەکرێت، کە پرۆگرامەکانی خوێندن، زیاتر بەرەو پیشەیی ببرێنو گرنگی بە بابەتە کردارییەکان بدرێت. بڕی ئەو داهاتەی کە تاك دەستی دەکەوێت، بەندە لەسەر بڕی ئەو فێربوونەی کە لە قۆناغەکانی خوێندنیدا وەری گرتووە، بۆ نموونە: ئەگەر ئاستی فێربوونەکەی تا قۆناغی پزیشکی بووبێت، ئەو داهاتێکی زیاتری دەست دەکەوێت لە مامۆستایەك، یان لە پارێزەرێك.

٣. کاریگەریی پەروەردە لەسەر داهاتی خێزان: ئەگەر بپرسین سەرمایەی مرۆیی، کە مەبەست لێی فێرکردنە، لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ بەدڵنیاییەوە وەڵامەکەی ئەوە دەبێت لەخێزانەوە؛ چونکە تاکە وەبەرهێنان لە مرۆڤدا، بریتییە لە سەرمایەی مێشكو ئاستی زانینەکەی کە سەرەتا لە خێزانەوە وەری دەگرێت، چی لەسەر ئاستی تاك، یان ئاستی نەتەوەبێت؛ چونکە خێزان بناغەی کۆمەڵگەو پایە ئابووریەکەیەتی، بۆ وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆیی، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ خێزان، لەبەرئەوەی هەر لەمنداڵییەوە، لە خەمی ئەوەدان، چۆن بتوانن منداڵەکانیان بخەنە قوتابخانە؛ تا بەرزترین بڕوانامە بەدەست بهێنن؛ بۆئەوەی بتوانێت سەرچاوەیەکی باشی بژێوی بێت بۆیان.

خێزانەکان بڕیاری ئەوە دەدەن، ئایا وەچەی زیاتر بخەنەوە، یان کەمتر؛ چونکە هەروەك لە پێشەوە گوتمان، هەر منداڵێکی زیاتر بارگرانییەك بۆ سەر داهاتی خێزان دروست دەکات، زۆرجار وڵاتان لەڕێگەی فێرکردنو ڕۆشنبیرییەوە هەوڵی ڕێکخستنو کەمکردنەوەی وەچە دەدەن، یاخود بە یاسا، ڕێگری لەو کارە دەکەن، ئەمەش بە ئامانجی زیادکردنی داهاتی تاکەکانی خێزان، لە نموونەی ئەو وڵاتانەیش کە لەو بوارەدا سەرکەوتوو بوون، بریتین لە تایوان کە ڕێژەی لەدایکبوون تێیدا کەمتر بووە لە چاو ئەمریکا، هونگ کۆنگ، مەکسیك، پۆڵەندا.

لە بەشە پێشکەوتووەکەی تورکیا، تێکڕای لەدایکبوونی منداڵ کەمترە، تا بەشە دواکەوتووەکەی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیو ڕادەی فێربوونو ڕۆشنبیریی نێوان ئەو دوو بەشە، بۆ نموونە: تێکڕای ژمارەی منداڵ لە خێزانە ڕۆشنبیرەکاندا بریتییە لە ١،٤ واتە: سێ منداڵ بۆ دوو خێزان، بەڵام لەناو ئەو خێزانانەی کە کەمتر ئاستی ڕۆشنبیرییان بەرزە، یان خوێندەواریان نییە تێکڕای ژمارەی منداڵ تێیاندا ٥،١ منداڵە، ئەمەش ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی

تورکیا دەگرێتەوە.

کەواتە: بۆ کەمکردنەوە ڕێژەی لەدایکبوونو نایەکسانی لە داهاتەکان لە نێوان ناوچەکانی تورکیادا، پێویستە زیاتر گرنگی بە پەروەردەو فێرکردن بدرێت، بەتایبەتی فێرکردنی دایکو باوك؛ بۆئەوەی بەپێی پێویست وەچە بخەنەوەو جیاوازی لە نێوان ناردنە قوتابخانەی منداڵی کورو کچدا نەکەن. هەروەها ئەوەش زانراوە، پەروەردەو فێربوون، دەتوانێت تەندرووستیی تاك بەرەو پێش ببات، لانی کەم دەتوانێت، چۆن بچێت بۆ نەخۆشخانە لە کاتی نەخۆشیداو چۆن ئەو دەرمانانە بەکار بهێنێت کە وەری دەگرێت.

بۆ نموونە: خەڵکانی ڕۆشنبیر لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو چەند وڵاتێکی پێشکەوتووی تر، کەمتر جگەرە دەکێشن، (کە جگەرە نەکێشانیش بۆ خۆی داهاتێك بۆ تاك دەگێڕێتەوە)، بۆیە دەرکەوتووە ئەوانەی زیاتر لە ئەمریکا جگەرە دەکێشن، ئەوانەن کە ئاستی فێرکردنو خوێندەوارییان نەگەیشتۆتە زانکۆ، هەروەها ئەوانەی کە لە قۆناغی ئامادەییدا وازیان لە قوتابخانە هێناوە. خەڵکی ڕۆشنبیر، یان خاوەن بڕوانامە لە تورکیا، زیاتر بەکارکردنەوە خەریکن، بەڵام خەڵکانی تر زۆربەی کات لە چایخانەکاندا دادەنیشنو جگەرە دەکێشن.

گەشەی پەروەردەو ئاستی ڕۆشنبیریی هەژاران، نەك تەنها یارمەتییان دەدات بۆ چاککردنی ژمارەی خواردەمەنییەکانیان لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی داهاتەکانیانەوەو خەرجکردنی بۆ دەستکەوتنی خۆراك، بەڵکو یارمەتییان دەدات جۆری خواردنەکەو لایەنی تەندرووستیو هەڵبژاردنەکەشی چاك بکەن. هەموو ئەو توێژینەوانەی کە بینراون لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا ئەوە دەردەخەن، کە خەڵکی ڕۆشنبیر، مەیلی بەکارهێنانی خواردەمەنی تەندرووست دەکەنو لەو پێناوەشدا بڕێکی زیاتری پارەی بۆ تەرخان دەکەن، هەروەها ئەوە زانراوە کە ئەو کەسە ڕۆشنبیرانەی زیاتر گرنگی بە تەندرووستی خواردن دەدەن، تەمەنیان لەوانی تر زیاترە، کە گرنگی بەو بوارە نادەن، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئاستی ڕۆشنبیری، ڕێژەی مردن کەم دەکاتەوە.

٤. **کاریگەریی پەروەردە لە سەر بازرگانی:** کاریگەریی پەروەردەو فێربوون لەسەر بازرگانی، لەوەدا دەردەکەوێت، کە ئەو وڵاتانەی سەرکەوتووبوون لە کردنەوەی سنوورەکانیان بە ڕووی بازرگانی دەرەکیدا، توانییان گەشە بە بواری پەروەردەو فێرکردن لە وڵاتەکانیاندا بدەن؛ چونکە کرانەوە، هەلی فێربوون زیاتر دەرەخسێنێت، هەروەها فێربوون وا دەکات سێکتەری ناردنە دەرەوەی شمەك زیاتر بخاتە بواری کێبڕکێی بازاڕە جیهانییەکانەوە؛ چونکە جۆرەکەی باش دەکات، ئەمەش وا دەکات لە بازاڕەکاندا زیاتر داواکاری لەسەر بێت، کەڵەکەبوونی زانیاری، ڕادەی ناردنە دەرەوە لە بازرگانیدا زیاتر دەکات، بەپێچەوانەشەوە. بازرگانی دەبێت بەهۆی گەشەی زانیاری، ئەمیش لە ڕێگەی هاوردەنییەکانەوە، بەتایبەتی لە ڕێگەی سوودوەرگرتن لە ئەزموونی وڵاتانی تر.

لۆکاس تێبینی ئەوەی کردووە، بۆ کەڵەکەکردنی زانیاری، پێویستە وڵات هەناردەکارێکی باشی بازرگانی بێت، بەڵام یەنگو کیلەر پێیان وایە، کە بازرگانی لە خودی خۆیدا، بەتەنها ناتوانێت ببێتە جووڵێنەری گەشەی ئابووری، ئەگەر هەموو میکانیزمەکانی تری لەگەڵدا پەیڕەو نەکرێت وەکوو پێکهێنانی سەرمایەی مرۆیی کە ئەویش پێویستی بە فێرکردن هەیە. هەروەها لیکۆڵینەوەیەکی بانکی نێودەوڵەتی بۆ شەست وڵاتی تازە پێگەیشتوو لە نێوان ساڵانی ١٩٦٥ - ١٩٨٧ دەری خستووە، کە ڕێژەی گەشەی ئابووری لەو وڵاتانەدا بەرز بۆتەوە کاتێك ئاستی ڕۆشنبیری تاکەکان زیادی کردووە ئەو وڵاتانە بە ڕووی دنیادا کراونەتەوە.

کرانەوەی بازرگانی، لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە خەڵك دەتوانن ئاشنا بن بەو زانیارییانەی کە لە وڵاتانی ترەوە لەڕێگەی بازرگانییەوە دێنە ناو وڵاتەوە، یاخود لە ڕێگەی هاتنی کۆمپانیا بیانییەکان، بۆ وەگەڕخستنی سەرمایەکانیان لە ناوەوەی وڵاتدا، ئەمەش سوودی زانیاری بە خەڵکی ئەو وڵاتانە دەبەخشێت. کەواتە: هەم پەروەردە دەتوانێت ئاستی گەشەی بازرگانیی وڵات زیاتر بکات لەڕێگەی ناردنە دەرەوەوە، هەمیش بازرگانی دەتوانێت سوود بە کەڵەکەکردنو هێنانی زانیاریو ئەزموونی نوێ بێت لە وڵاتانی ترەوە لە ڕێگەی هێنانە ناوەوەی شمەكو زانستی دەرەکییەوە.

## دەرئەنجامەکان

لەم توێژینەوەیەوە، دەتوانین چەند دەرئەنجامێك بە دەستبێنین:

١. پەروەردە پرۆسەیەکی گشتگیری هەمەلایەنەیەو هەموو تاکێك دەبێت بەو پرۆسەیەدا بڕوات؛ بۆئەوەی ببێت بە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی، یاخود تاکێك لە کۆمەڵگەکەی خۆی.

٢. پەروەردە مرۆڤ بەو شێوەیە پێدەگەیەنێت کە کۆمەڵگە داوای دەکات، ئەمەش مانای ئەوەیە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا پەروەردە ڕەنگدانەوەی ئەو بەهاو دابونەریتەیە کە کۆمەڵگە هەیەتی.

٣. ئەرکی پەروەردە، ئەرکێکی تەواوکارییە، واتە: بەیەك لایەن تەواو نابێت، بەڵکوو چەند دەزگاو دامەزراوەیەك ڕۆڵیان هەیە لە تەواوکردنیدا، وەك خێزان، قوتابخانە، ڕێکخراوەکان... هتد.

٤. پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە لەنێوان پەروەردەو زانستی ئابووریداو هەریەکەیان کار لەیەکتری دەکەن، پەروەردە دەتوانێ گەشە بە ئابووری بدات، ئابووریش ڕۆڵی گرنگی هەیە لە پێشخستنی پرۆسەی پەروەردەدا.

٥. تا ئاستی گەشەی فێرکردنو پەروەردەی تاك بەرزبێتەوە؛ ئەوا ڕێژەی بەرهەمی نەتەوە لە کۆمەڵگەدا بەرز دەبێتەوە، ئەمەش ئەو کاتە دەبێت کە ڕێگاکانی بەرهەمهێنان بەزانستی بکرێن.

٦. پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن، ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە بەرزکردنەوەی داهاتی تاکەکەسدا؛ چونکە ئەوانەی خوێندەوارییان هەیە، یان توانای زانستیان بەرزترە، دەتوانن کاریان دەست بکەوێت، یان کرێی زیاتر لە کارکردندا وەربگرن.

٧. ڕۆشنبیریی خێزانەکان لە هەموو ڕوویەکەوە، بەستراوەتەوە بە ئاستی فێربوونی ڕۆشنبیرییانەوە، ئەمەش خۆی لە هاندانی منداڵەکانیانەوە دەبینێتەوە بە خستنە قوتابخانەیانو خەرجکردنی پارەیەکی زۆر تێیاندا بە ئامانجی بەرەوپێشبردنی گەشەی زانستییان کە پێی دەگوترێت: سەرمایەی مرۆیی، یاخود ڕێکخستنی وەچەو منداڵبوون، ڕێژەی داهاتیان بەرز دەکانەوە.

٨. پەروەدەو فێرکردن، کاریگەری لەسەر بەرزکردنەوەی توانای بازرگانی هەیە؛ چونکە دەبێت بەهۆی زیادکردنی ناردەنییەکان بۆ دەرەوەی وڵات، هەروەها وەرگرتنی زانستو زانیاریی نوێ لە وڵاتانی تر لە ڕێگەی کرداری هاوردەکردنەوە.

## وانەیەك بۆ ژیان

# عەقڵ لە دیدی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی



مەلا عەبدوڵڵا شێرکاوەیی

یەکێك لەو بەهاو تایبەتمەندییانەی خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە، بوونی عەقڵە، کە بەهۆیەوە مرۆڤ لەسەرجەم گیانلەبەرانی تر جیا دەبێتەوە، دەتوانێت وەك زیندووترینو کاراترین بوونەوەر هەنگاو بنێتو داهێنانو کاری شیاوو شتی ناوازە بەرهەم بێنێت.

چەمکی عەقڵ لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) زۆر باس کراوە، لەسەر ئەو بنەمایەشە کۆی پابەندبوونو بەجێگەیاندنی فەرمانە شەرعییەکان، بەندە بە هەبوونی ژیرییەوە، لەم لاشەوە ئیسلام بۆ پاراستنی عەقڵ، چەندین ڕێکاری تایبەتی دارشتووە، هەر جۆرە دەستدرێژیو زیانگەیاندنێك بە عەقڵ، بەتاوان دادەنێتو سزاو لێپێچینەوەی بۆ داناوە.

وەلێ دیدی زاتێکی وەك مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، بۆ چەمکی عەقڵو لێکدانەوە فەلسەفیەکانی لەو بارەوە، کە بە ڕای من ئەو شیکارەی، بە دیوێك تەواو جیاوازە لەگەڵ زۆرێك لە شرۆڤەکانی دیکەی چەمکی عەقڵ لەلایەكو پێویستییەکی هەمیشەیی جوانو بەجێو سەرکەوتووانەیە بۆ هۆشیاری تاك، لەم بوارە لەلایەکی ترەوە؛ چونکە بە بۆچوونی ئەو، پیشەو ئەرکی عەقڵ، ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی هەیە لەنێو لێکدانەوەو بەرەوپێشچوونەکانی ژیانی دینداری کەسێتیی موسوڵماندا.

ڕۆمی تەنها ڕەخنە لە ڕووکەشیبوونی ئەندامە هەستیارەکانی جەستە ناگرێت، بەڵکو دێتە سەر عەقڵو پێی وایە ئەو عەقڵەی ناو جەستەی مرۆڤ، بەتەنها ناتوانێت بگاتە ناوەڕۆكو لوتکەی ڕاستییە شاراوەکانو نهێنییەکانی جیهانی شاراوە، بۆیەش کە مەودای لێکدانەوەی ئەم جۆرەی عەقڵ بۆ شتی بینراوو هەست پێکراو دیاری کراوە، بە عەقڵی (سنووردار) ناوی دەبات، کە زیاتر بەلای شتە ماددییەکانەوە دەڕواتو زادەی کۆی ئەو خەیاڵو گومانو سۆزو بینینانەیە، کە مرۆڤ لەناویاندا دەخولێتەوە.

بەپێی ئەزموونو لێکدانەوەی مەولانا، کە ئەو وای دەبینێت، هەر کەسیش خۆی لەو مەودایە ماندوو بکات، دەگاتە ئەو دەرەنجامە، کە عەقڵی سنووورداری مرۆڤ، تەنها توانای لێکدانەوەی شتە هەستپێکراوو دیارەکانی هەیەو ناتوانێت بچێتە ناو قووڵاییی هەقیقەتو پرسو بابەتەکانەوە، ئەو دەڵێت: ئەگەر تەنها عەقڵی جەستەیی پێوەر بوایە بۆ هەڵسەنگاندنی کاریزمایی کەسەکانو گەیشتن بە ڕاستیو دەسکەوتە گەورەکان؛ ئەوا دەبوو ئیمام فەخرەددینی ڕازی، وەك گەورەترین عاریفو شارەزا هاتبا پێناسەکردن. سەبارەت بە ڕۆچوونو قووڵبوونەوەی بە بناوانی دیندا، بەڵام پێوەرەکە شتێکی ترە کە بریتییە لە هێزێکی تری هاوشێوەی ئەو هێزە عەقڵانییەی خۆی، کە دەرەنجامی تینوێتیو سووتانو خولانو تامەزرۆییو شەیدابوون بووە بەنێو شەپۆلە ئیمانیو یەقینیو عیرفانییەکانەوە.

بۆیە مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی، دوای هەوڵو لێکدانەوەو بەدواداچوونێکی زۆرەوە، دەگاتە ئەو ڕاستییە، کە نهێنی گەیشتنی یاوەرو خواناسو زاناو شارەزاو بیریارو هەڵکەوتووانی نێو زیاتر لە چواردە سەدەی مێژوویی ئیسلامی بە بەرزترین ئاستی خواناسیو دینداریو سەرکەوتنو بەختەوەری، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە پابەندبوون بەو هێزە ئیمانییە پڕ ئیخلاسە شاراوەیە، کە عەقڵ ئاراستە دەکات، ئا لێرەیە، لە دیدی مەولانادا، عەقڵ دەبێتە دوو بەش: عەقڵی جەستەییو عەقڵی ئیمانی..

**عەقڵی جەستەیی:** بریتییە لەو هێزە سنووردارە شاراوەیەی لە مرۆڤدا هەیەو ڕابەرایەتیی چالاكیو پێویستیو مەبەستە تایبەتەکانی جەستە دەکات، بەردەوام مەیلو ئاسۆی بەلای تێرکردنی حەزو ویستەکانە، لەو سۆنگەیەشەوە زۆربەی کات خاوەنەکەی بەلای شتە ماددیو ڕووکەشو شەهوانییەکان دەبات، پەلکێشی نێو بازنەی تاوانو سەرپێچیو خۆبەزلزانینو ئەنانیەتی دەکات، سەرەنجام تەنهایی ئەو عەقڵە، مرۆڤ بەرەو سەرگەردانیو یاخیبوونو نامۆییو پاشەکشێی کەسێتیو سەرکێشیو نالەباریو دەردەسەریی زۆر دەبات.

**عەقڵی ئیمانیش:** ئەو هێزە شاراوە مەودا فراوانو گەوهەردارو کاریگەرەیە، کە وەك شوعلەی نوورو نەرمیی ئاوو بڵێسەی ئاگرو تیشکی خۆر، تاریکییەکان ڕووناك دەکاتەوەو بەهەموو کونو کەلەبەرو بەرزیو نزمییەك دەچێتە خوارێ، بەهاو سەنگینی دەکاتە بەر عەقڵی جەستەییو کۆی جوانییەکانی ژیانی بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو دەیخاتە سەر ڕێگە ڕاستەکە، ئەو ڕێگا مەودادرێژەی مرۆڤ بە نهێنییە شاراوەکان شاد دەکات، بەختەوەریی دونیاو سەرفرازیی دوارۆژی بۆ وەدەست دەهێنێت.

مەولانا جەلالەددین لەو نێوەدا، عەقڵی جەستەیی بە توێکڵو عەقڵی ئیمانیش بە کاکڵ دادەنێت، بەواتایەکی تر پێی وایە، عەقڵی ئیمانی بەرامبەر بە عەقڵی جەستەیی، وەك مامۆستا وایە بۆ قوتابی!!

# مامۆستاکەم

سایە سەرگەتی

سڵاو... لەو مامۆستایەی تێڕوانینی منی بۆ بەڕێوەبردنی وڵات گۆڕی، تۆ کە بەمنت سەلماند، زانست بنچینەی هەموو شتێکە..

هەموان دەڵێن: کاتێك گوێ لە وتە زانستییەکانی تۆ دەگرن، بیرکردنەوەیان زۆر گەورە دەبێت، هەستی زانستیبوونو دیزاینەری لەناخی هەمواندا چەکەرە دەکات، مامۆستاکەم، من ناتوانم بە باشترین مامۆستا ناوت بهێنم؛ چونکە تەواوی مامۆستاکانم باشترینن، بەڵام بەڕێزت باشترینی لەبنیادنانی کەسێتیی بەهێزی نەوەکانی داهاتوو، کاتێك جەخت لە نەترسانی ئێمە دەکەیتەوە، کاتێ بیرۆکە سادەکانی ئێمە، دەگۆڕیت بۆ پرۆژەی زۆر مەزن، کاتێك دڵنیامان دەکەیتەوە لە داهاتوو، لەکار، ناتوانم هیچ شتێك بڵێم جگە لە سوپاس، مامۆستاکەم، کاتی شکست دەمەوێ لە هەموو خوێندنم گەڕێمو بەدوای خەونە تایبەتییەکانمدا بڕۆم، بەڵام کاتێك گوتەکانی تۆم بیر دێتەوە، هەستێك خەریکە پێم دەڵێت، کە من نامەوێت قوتابی تۆ بم، من دەمەوێت ببم بە کەسێکی وەك تۆ، یان باشتر لە تۆ، بەتەواوی سەرکەوتنەکانتەوە.

من خەونی ژیان وەك کەسێکی زانستی لەتۆوە فێربووم، زانیم کە هۆکاری دواکەوتنی وڵاتەکەم چییە، تکایە بمێنەوە، لەو ڕێیەی کە بۆ خۆمم کێشاوە، دوای یارمەتیی خودا، زۆر پێویستم بە کەسانی وەك تۆیە، من ئاگاداری زۆربەی بەربەستەکانی بەردەم پێشکەوتنی تۆم، بەڵام تۆ دەتوانی خەونەکانت مەزنتر بکەیت، لە پۆلێکی سادەوە دەستت پێ کرد، دڵنیام ڕۆژێك دەگەیتە وڵاتێکی بەرهەمهێن، دەزانم قەدری زانست لێرە هێشتا نەگەیشتووەتە ئاستی شکۆمەندی، وەك گۆران دەڵێ:

لەناو قەومی بەسیتا، قەدری سەنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لیخندا

چەند وێنەت لەناو خەڵکی بەدکار، خراپتر بێت؛ ئەگەری نەمریت زۆرتر دەبێت، لێگەڕێ نەیاری بکرێیت، ئەمە سەرکەوتنە بۆ بەڕێزت. مامۆستاکەم ئاگاداربە، مەزنیی هەرکەسێك لەناخدایە، کاتێك توانای یارمەتیدانی هەموانمان هەبوو، ئەمە بەخششێکی خودایە، ئێمە بۆ خزمەتی خەڵکەکەمان لێرەین، با ئەمە پەیامان بێت، مامۆستا، ئەوکارە لاوەکییانەی کە کاتی زاناکان دەبات، زۆر لە دیکتاتۆری بۆ وڵات خراپترە؛ چونکە ئەگەر زاناکان بێباك بن، ئەوە وڵات بەرەو داڕووخانی زۆر قووڵ دەچێت، بەڵام دیکتاتۆرەکان تەنها دەتوانن کار لەشتە کاتییەکان بکەن، زاناکان دەبێت بەڕۆژ خەڵکی پەروەردە بکەنو بەشەویش خەریکی داهێنان بن، مەهێڵە هیچ شتێك بێئومێدت بکات، تکایە زانا بە، تۆ دەتوانی لەنێو بیابان، شارێکی پڕ لە سەوزایی درووست بکەیت، بەدڵە پاکەکەت، تەواوی خەونەکانت بەدی بهێنیت. من چاوەڕێم لەهەموو شوێنێکەوە، دەنگی سەرکەوتنی تۆ بێت، داهاتووە پرشنگدارەکەت هێشتا دەستی پێ نەکردووە.. مامۆستاکەم، دەزانی چەند کەس لەم وڵاتەدا، پێویستی بەتواناکانتە.. تکایە خەمەکانت بدە بە کۆتابارانی ئەم ساڵو نیشتمانپەروەریی زیاتر بنوێنەو دەست پێ بکە، منیش لەگەڵت دێم، دەمەوێت ببم بە ڕێبواری ئەو ڕێیەی کە وڵاتەکەم بەرەو گەشەسەندنو داهێنان دەبات.






# بڕیار له‌ چه‌ند دێڕێكدا

٢٠٠٨/٥/٢٠ ده‌رچوونی یه‌كه‌مین ژماره‌ی گۆڤاری بڕیار

٢٠١٦/٦/١ ده‌رچوونی ژماره "٩٦"ی گۆڤاری بڕیار

كـۆی تیراژی ژماره‌كانی گۆڤاری بڕیـار، تا ژماره "٩٦": (٢٤٥٤٠٠) دووسه‌دو چل‌و پێنج هه‌زارو حه‌وتسه‌د دانه‌یه!

چاپكردنی "٢٤" كتێب، به‌ تیراژی (٦٥٤٠٠) شه‌ستو پێنج هه‌زارو چوارسه‌د دانه‌.

**دیزاینكردنی چه‌ند ژماره‌یه‌كی ئه‌م گۆڤارانه‌:**

١. هه‌یڤ.
٢. بازرگانی‌و پیشه‌سازی.
٣. ئاینده‌سازی
٤. بره‌و.
٥. چرای رووناكی.
٦- سایه‌.
٧- په‌یام.

جگه‌ له‌ چه‌ندین بڵاوكراوه‌ی ده‌ره‌وه‌ی گۆڤاری بڕیار.

به‌شداریكردن له‌ هه‌شت پێشانگای نێوده‌وڵه‌تیی كتێب له‌ شاری هه‌ولێر، له‌ ساڵی ٢٠٠٩ تا ٢٠١٦

**كردنه‌وه‌ی دوو پێشانگای تایبه‌ت:**

یه‌كه‌م: ساڵی ٢٠١٢
دووه‌م: ساڵی ٢٠١٦

به‌شـداریكردن لـه‌ چه‌ندین كۆڕو سـیمینارو به‌رنامه‌و چاوپێكه‌وتنی ته‌له‌فزیۆنیدا.

دابه‌شـكردنی سـه‌دان ژماره‌ له‌ گۆڤاری بڕیار، به‌سـه‌ر ده‌زگاو شـوێنه‌ گشـتییه‌كاندا بـه‌ سپۆنسـه‌ری گرووپـی كۆمپانیاكانـی ڕه‌سـه‌ن، به‌ ئامانجی هاندانـی خوێندنه‌وه‌و گه‌شه‌پێدانی مرۆیی.

**به‌ ده‌رچوونی ژماره "٩٦"، بڕیار پێ ده‌نێته‌ ته‌مه‌نی "٩" ساڵی‌و مۆمی ته‌مه‌نی نۆیه‌می داده‌گیرسێنێت!**



تۆ کە دەرکەوتی، مەپرسە چی بەسەر دێ جانو دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشاکە، بە وەختی ڕۆژهەڵات ـ مەحوی ـ

# تۆ!

گەرمیانی

لە درێژترین سوژدەدا، دوعام بۆ کردی.. لە پیرۆزترین ساتەوەختا، لە دوا چرکەکانی ڕۆژی هەیینیدا بۆت پاڕامەوە..

ئەو کاتەی جگە لە خوداوەند، کەس ئاگادار نەبوو، بە زمانی دڵم ناوم بردیو ڕازونیازی ئەم ئەوینەم بۆ پەروەردگار گێڕایەوە!

چ ڕیباتێکی موقەددەسە، ئەوینێك خودا چاودێری بکات!

چ خۆشەویستییەکی بێسنوورە، ئەو کاتەی یار دەبێتە داواو نزاو تکای ڕۆژو شەو!

ئەو کاتەی وجوود هەموو دەبێتە تابلۆی سیمای ئەو؛ سەدا هەر دەنگی ئەوە، گوڵاو هەر بۆنی ئەوە، تیشکی خۆر هەر نووری ئەوە، خەیاڵ میوانی ئەوەو دڵ هەمیشە سەرقاڵی یادی ئەوە!

شنەی با، باسی جوانی ئەو، بە گوێی مندا ئەچرپێنێ
هەموو دەرکەوتنی شۆخێ، دڵی من دائەخورپێنێ
بەڵام خورپەی تەواوی دڵ، لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
کە سەرتاپا، لە ئاوازی بەهەشتی خواوە پەیدایە ـ هەردی ـ

کەواتە: سەیر نییە، لە موناجاتی سەحەریشدا، لە سکاڵای دڵو هەنسکی نیوەشەویشدا، لە گریانو ئەنینی مولتەزەمیشدا، جگە لە تۆ، داوایەکی دیم نەبێ!

چونکە من، جگە لە تۆ، کەسی دی نابینم، با خەڵکی جگە لە خۆم، کەسی دی نەبینن!

حاڵی من، "پەشێو" وەسفی دەکات، کە دەڵێت:

بە تۆ دەبینم
بە تۆ دەبیسم
بە تۆ دەپەیڤم
کەچی مخابن!
ناوبانگ هی منەو ئەتۆش بزری
چەند لام ئەستەمە، هەروا دەزانن
کە تۆ، من نیتو کەسێکی تری!

ئەمە ئەو توانەوەیە، کە ئیدی هەموو سنوورەکان دەسڕێتەوە، ئیدی ڕۆحت لە ئامێزی ئەو ڕۆحەدا نەبێ، ئۆقرە ناگرێ!

ئیدی دڵت لە دەریای میهری ئەو دڵەدا نەبێ، ناسرەوێ!

دڵێك لە هەموو ساتەکانی ژیانتدا هاوڕێتە!

هەموو شتێکت لەگەڵدا بەش دەکاتو بێ بوونی ئەو، لەم دنیایەدا تامی هیچ ناکەی!

چونکە گرنگی بە هەموو وردەکارییەکانی ژیانت دەدات، چرکە بە چرکە، هەناسە بە هەناسە!

ئەو بێزارت ناکات، بەڵکو گرنگیت پێ دەدات، تەنها لە تۆدا، هەموو جوانییەکانی وجوود دەبینێت!

وەکوو باباتاهیری عوریان، دەگاتە ئاستێك کە دەڵێت:

لە سەیری دەشتو مەزرا، تۆ دەبینم
کە دەڕوانم لە دەریا، تۆ دەبینم
کە دەڕوانم لە هەر کێوو دەرو دەشت
نیشانەی بەژنو باڵای، تۆ دەبینم

ئیدی جگە لەو، زێدو نیشتمانێك نییە بۆ حەوانەوە، ئیدی دەرمانێك نییە بۆ دەردی دڵ، ئیدی مەرهەمێك نییە بۆ برینەکان!

چونکە ئەو کەسە، لە دژوارترین ساتەکانی ژیانتا هاوڕێتە، لە خراپترین هەڵسوکەوتتدا، میهرەبانترین مرۆڤە، بۆ گەورەترین گوناهت، گەورەترین لێخۆشبوونی هەیە! وەکوو دایکت، بۆت پەرۆشە! شەوانە خەمێتی، نەوەك سەرمات بێ!

لە پێناوی تۆدا، هەموو شتێ دەکات!

چونکە دەمێکە خودی خۆی لەیاد چووە!

هەموو ئاواتەکانی، تەنها گەیشتنە بە تۆ!

وا سەرم دانا بە عەزمی بەردەبازی ڕێگەکەت
مەرهەمی دەردی سەری من ، وا بە هەردی پاتەوە - ناری ـ

چونکە بە دەرکەوتنی ئەو، ئیدی تاریکی شەوی دووری لادەچێو دەگەیتە فیردەوسی ڕۆحی خۆتو خەمو پەژارە، ئیدی ناتوانن توخنت بکەون!

ئیدی بە چاوانت، لەبری گریان بۆ جەماڵی حەقیقی دەڕوانی!

بە هەستانی لە خەو، تاریکەشەو لاچوو، بەیان بەربوو
دەڵێن زوڵفی پەرێشانی، وەلا دا ماهی تابانم -حەقیقی-

# نامە نوورییەکان

## نامەی پەنجاوسێ

گەیشـــتنی ئەم نامەیەم لە کاتێکدایە، کە تەنها چەند ڕۆژێك ماوە بۆ گەیشتنی میوانێکی ئازیزو لەدڵاشیرین..

دەســـتەونەزەر لە پێشوازیداین، ڕۆحمان زۆر ماندووە، زێتر لە لاشـــەمان، بە ڕووخســـارێکی کـــزەوە، بە دیدێکی شەرمنەوە، چاوەڕوانی هەڵاتنی هیلالی ڕەمەزانین!

لـــە ئینتیـــزاری میوانێکدایـــن، کـــە لەگـــەڵ خۆیـــدا، گەورەترین خەڵاتی هێنا! کە قورئانی پیرۆزە!

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩

قورئـــان، ئـــەو پـــەڕاوەی کە تاکە ســـەرچاوەی خێروخۆشـــیو ســـەعادەتو ســـەربەرزیو ســـەرفرازیو پێشکەوتنو ســـەرکەوتنو سەربەستیو ئارامیو دڵنیاییو بەختەوەریمانە!



ئەو قورئانەی کە نووری موبینو چرای درەوشاوەو بارانی ڕەحمەتو مەرهەمی دڵانو دەرمانی دەردانو چارەی گرفتانو هێزی ژیانو پاسەوانی هەموو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤە!

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴾ النساء: ١٧٤

قورئان ئەو پەیامەی کە وتەی جوانی پەروەردگارە، کە هیچ پەڕاوو کتێبو نووسراوێك، ناکاتە بەرزیو بڵندیو جوانیو ڕاستیو دروستیو شیرینیو حەلاوەتی وتەو ماناکانی!

﴿ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ المائدة: ١٥ - ١٦

هەر بۆیە نازناوی مانگی ڕەمەزان، مانگی قورئانە، شەوی دابەزینی ئەو خەڵاتە مەزنەش، شازادەی شەوانی ڕەمەزانو گەورەی هەموو شەوانی ساڵەو هێندە گەورەیە، کە بەرامبەر هەزار مانگە!

ڕەمەزان، یاداشتی گەورەترین یادگاریی کەون!

ئێوارەی گەڕانەوەی نازدارترین مرۆڤ لە یەکەمین دیداری فریشتەی ئاسمانو بیستنی یەکەمین ئاوازی بەهەشتیی سەدای ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾ ـە..

ئێستا لەگەڵ ئەم وشانەدا، ناخم دەلەرزێ، هەژانێك وەك زەمینلەرزە، سەراپای ڕۆحو جەستەی داگرتووم!

ئێستا وا لە بەرچاومە، پەیامبەر گەڕاوەتەوە بۆ ماڵو خۆی لە باوەشی پرمیهری خەدیجەدا شاردۆتەوەو لە هەیبەتی ئەو دیدارە گەورەیەدا داوا دەکات «زملوني، زملوني».

ئێستا دەبینم، زەنگۆڵ زەنگۆڵ گوڵاوی ئارەقی نبوەت بەسەر گۆنای مونەوەریدا دێنە خوارێ!

دەبێت سەداو زایەڵەی ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾، ئەو دڵە گەورەیەی چۆن کردبێت بە ئاوریشم!

ئەو پەیامبەرە نازدارە، بە یەك وشەی ئەو قورئانە توایەوە!

چونکە وەرگرتنی پەیامی ئاسمانو وتەی پەروەردگار، خۆ کارێکی هەر وا سانا نییە!

حەسەنی بەسری دەڵێت: پێشینان، قورئانیان بە نامەی خوداوەند دەزانی بۆ ئەوان!

لە شەودا لێی ڕادەمانو بە ڕۆژیش کاریان پێ دەکردو جێبەجێیان دەکرد!

شەوانە، شەوچرای ماڵەکانیان بوو، لە خوێندنەوەو بیرکردنەوە لە ماناکانی تێر نەدەبوون..

لەسەر باڵی ڕەشی شەودا، هاوڕێ بە پیتە زیوینەکانی قورئان، باخی دڵیان بە بارانی ئەسرین ئاو دەداو بە سینەی پڕ لە ئیمانیان، نەسیمی فیردەوسیان هەڵدەمژی!

﴿ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾ المزمل: ٤

ئای لە شەوانی ئەهلی قورئان!

سەدای قورئانو دەنگی گریانە
کزەی دەروونی ئەهلی ئیمانە
هاوارەو نزاو تکایەو ڕەجا
داوای ڕەحمەتو میهرو غوفرانە

موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەضی دەڵێت: « هەر کەسێك قورئانی پێ گەیشتبێ، وەکو ئەوە وەهایە، کە خودای گەورە، خۆی گفتوگۆی لەگەڵ کردبێت»!

چونکە ئەو قورئانە، بۆ ئەو هاتووەو خودای گەورە، ڕووی وتەو گوفتاری لەو کردووە، هەروەکو ئیبنو مەسعوود دەڵێت: «کاتێك دەبیستی خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ گوێی بۆ ڕادێرە؛ چونکە ئەوە، یا خێرێکە فەرمانت پێ دەکرێت، یا خراپەیەکەو لێی دوور دەخرێیتەوە»!

ئازیزم، هەمووی چەند ڕۆژێکەو مانگی قورئان دەبێتە میوانمانو لە فێستیڤاڵی ڕۆحدا، دەچینە خزمەتی قورئانی پیرۆزو خۆشترین ساتەکانی تەمەنی لەگەڵدا بەسەر دەبەینو جوانترین یادگارییەکانی تەمەنی تێدا تۆمار دەکەین.

چی لەو کاتە خۆشترە، کە لەگەڵ هەموو وتەیەکی ئەو پەیامە پیرۆزەدا، هەست بە نەرمبوونی دڵمان دەکەینو بە مەداریجی بەندایەتیو شکۆی عبوودیەتدا، بەرەو مەقامی عاریفانو خواناسانو خواپەرستان هەڵدەکشێینو دیوەخانی دڵمان، بە چلچرای خۆشەویستیو شەوقو تاسەو ئارامیو تەسلیمبوون بە جەلالو جەمالی خودایی، دەبێتە چراخان!

ئەو کاتەی دەزانین، ژیان لەگەڵ قورئان زۆر جیاوازەو خوێندنەوەی کتێبێك کە هەر لە پێشەکییەکەیدا نووسراوە ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ ﴾ البقرة: ٢ لە هەموو کتێبەکانی دی جیاوازە!

کەواتە: با ئەو ساتە دەگمەنانەی ژیانمان، بەخۆڕا لەدەست نەدەین!

با ڕووی دڵمان بکەینە تیلاوەی قورئانو بە ڕۆحو لاشە لە خزمەتیدا بین!

با گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بینو لە قەدەغەکراوەکانی خۆ بپارێزین!

با لەسەرەتا. لە خودی خۆمانو ژیانی خۆمانو دەوروبەرماندا حوکمی پێ بکەینو بیکەینە چرای ڕێگاو ڕێبازی ژیانمان!

با وەکوو ئینو مەسعوود دەڵێت: پێویستە ئەهلی قورئان بناسرێ بە شەونوێژی کاتێك خەڵکی خەوتوون، بە ڕۆژووی کاتێك خەڵکی بەڕۆژوو نین، بە خەمو پەژارەی کاتێك خەڵکی کەیفخۆشن، بە گریانی کاتێك خەڵکی پێدەکەنن، بە بێدەنگیی.. کاتێك دەوروبەری سەرقاڵی قسەن، بە خشووعی.. کاتێك دەوروبەری، خۆیان بە گەورە دەزانن!

دڵنیام کۆبوونەوەی ڕەمەزانو قورئانو تەراویحو قیام، جەننەتی دڵو لەزەتی بێسنووری ڕۆحە، خودا لە هەمووومانی قبووڵ بکات!

# لەگەڵ فانی شاعیردا



"فانی" ناوی مەمەند ئاغای کوڕی ڕەسووڵ ئاغای میراودەلی قایمقامە.

ساڵی ١٩١٠ لە دێی مەرگەی ناوچەی پشدەر لەدایك بووە، باوکی قایقامی چەمچەماڵ بووەو دواتر دەکرێت بە یاریدەدەری موتەسەریفی سلێمانی، بەڵام پێش دەستبەکاربوون کۆچی دوایی دەکات.

بەمەش دەرگای کارەساتو ژیانی پڕ لە تراژیدیا، لە فانی دەکرێتەوەو ژیانێکی زۆرسەخت بەسەر دەبات.

"فانی" وێڕای سەختی ژیانی، خوێندوویەتیو شاعیرێکی کارامەو لێهاتوو بووەو خاوەنی شاکاری بەرزو قەسیدەی درێژە.

بەشێکی زۆری شیعرەکانی، بۆ نیشتمانپەروەریو کوردایەتی تەرخان کردووە.

شاعیر ساڵی ١٩٧٣ کۆچی دوایی دەکاتو لە گوندی مەرگە بە خاك دەسپێردرێت. ئەمەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی:

---

## جەوری نەزان

بە دووربینی نەزەر، جاریٚ تەماشای کوردەواری کە لەبەر جەوری نەزان بۆ گەل، وەکوو گەل مەشقی زاری کە ئەگەر پێت خۆشە، گەورەی دیٚ بلێ: وریایە، ئازایە دزێکی زۆر درۆزن بە، هەتا هەی، مەیلی خواری کە لە سەربەستی نەکەی بدوێی، دەنا زوو سەر دەکەی زایع سەرت پێویستە؟ پشتت زوو نەوی بۆ بەردەباری کە لە لای قەومێکی وا ژینت، ئەگەر لا باشە ڕۆژو شەو خەریکی فەوتی کۆمەڵ بە، دوعا بۆ نالەباریی کە لە چاکەی نیشتمان بدویٚ، موقەسسیر دەردەچی ئاخر وەتەن بفرۆشە، دووڕوو بە، شەقی بە، نابەکاریی کە ئەگەر پێت خۆشە ئەولادت، نەبێتە ژێر چەپۆکی کەس کە بوو، هەرجیٚ بەجیٚ، فێری نیفاقو حیرصو هاری کە کە جیرانت وەلاخێکی هەبوو، یا نەختە باراشیٚ بە شەرتی موشتەریك بوو دز، ئەویش بە دزیی دیاری کە کە گەل بینا نەبیٚ هیچی، عەزابی گیانە بینایی بە خۆڵی ئەحمەقی چاوت، وەکوو ئەو خەڵقە تاریی کە لەناو قەومی نەزان، زانا شەرابی خوێنی جەرگەو بەس کە هۆشێکت هەیە، فیکری ئەساسی خاکەساری کە لەژێر پێی قەهری نادانا، بڵێم چی. چۆنە حاڵی گەل لەناو پاساریا، سەیری هەرای بازی شکاریی کە نەزان، مانای ژیانی لا خەوو خۆراکە وەك ئێستر ژیان بیٚ مەعریفەت ژانە، تەمەننای خوێندەواریی کە لە گێتیدا نەما فانی، پزیشکیٚ بۆ دەوای دەردی کەوابیٚ، تۆ دەوا داوا لە قاپی بەرزی باری کە

---

## ئەمەش شاکارێکە لە شیعرەکانی:

گەلیٚ غەمگینە دڵ ساقی، دەسا دەی مەی لە مینا کە شەمامەی سینە، شەهدی دەم، لەگەڵ ئەو بادە ئیعطا کە لەناو حەلقەی سیا زوڵفا، دەناڵێنیٚ هوزاری دڵ چ سووچێکی نەبوو گرتت، ئەویشم بۆ بەرەڵلا کە بە بازاڕی جوانیدا، بەسەربەستی بڕۆ جاریٚ موریدو مورشیدو موفتی، وەکوو من شێتو شەیدا کە ئەگەر پێت خۆشە، کوردستان وەکوو جەننەت موعەتتەر کەی بکە زۆڵفی تەڕت شانەو سەعاتیٚ ڕووت بەرەو با کە دڵم مەشکێنە؛ گەنجینەی خەیاڵی خۆشەویستیتە بە عەشقی ئەو هەموو عەشقە، لەگەڵ دڵدا مودارا کە لە تاریکی شەوا جاریٚ، وەکوو ئەستێرە خۆت دەرخە بە زۆری نووری ڕۆژی ڕوو، سەرا غەرقی سورەییاکە خەدەنگی تیژی برژانت، لە جەرگی من مەدە چیدی لە مەیدانی غەرەزبازی، لە سینەی ناحەزی ڕاکە بە یادی لێوی شیرینت، وەکوو فەرهادی ناشادم وەرە، کوژراوی هیجرانت، بەشیرینی تەماشاکە دەوای دەردی منی بێکەس، مژینی لێوی ئاڵەو بەس لە بۆ چابوونەوەی دەردم، بەخۆشی خۆ موهەییاکە بەبیٚ گەنجی ویساڵی تۆ هەموو گەنجێکی سەر ئەرزی لەبەر ئەم چاوە ئەمناکە، وەکوو خاشاکە، یا خاکە جلی کوردی لەبەر خۆ کە، لە بەزمی مۆدەپۆشانا حەیاو حوسنو سەفا دەرخە، هەموویان بێسەرو پاکە کە بۆ عیلمو سەنایع بیٚ، جوانە پەیڕەویکردن دەنا بۆ حیفزی ئاوی ڕوو، لە جلکی مۆدە حاشا کە کچی کوردی، حەیاو عەزمە لە گێتی زینەتو خشڵی لە دوو دوو گەوهەری وا بەو تەماشای کوردی ئازا کە لەگەڵ ناکەس نەکەی بدوێی، کە هاتو ئەو دواندیتی بەچالاکی بێباکی، لە ئەو بێهۆشە هەیهاکە کە "فانی" عیشقی پاکی بیٚ، دڵی پاکی مەڕەنجێنە بە دەستی مەرحەمەت، جێگەی لە باغی سینە، بۆ جا کە